حکومەتــا هەرێما کوردستــانێ – عیراق

وەزارەتا پەروەردێ

ڕێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# کۆمپیوتەر

## مایکرۆسۆفت ئێکسل

## بۆ پۆلا دەهێ ئامادەیی

### ئامادەکرنا

ڕونـــاک محمد عبـــدالله | ڕێــزان حمەرەشید کریم

سۆزان نەریمان حمەصالح | ئومێد صادق عبدالکریم

محمد ئــەبوبکر تـــۆفیق | هـــادی حمەرەضا عزیز

### هاتییە کرمانجیکرن ژ لایێ

ســربست تـوفیق عــارف | غریبـــة شعبـــان عمر

مصطفی سلیمان محمد

### پێداچوونا زمانی

طە یاسین طە

### پێداچوونا زانستی

سگڤان حسن علي

### سەرپەرشتیا زانستی

سگڤان حسن علي

چاپا چوارێ ٢٧١٥ کوردی ٢٠١٥ زایینی ١٤٣٦ مشەختی

# ناڤەرۆک


| بابەت | ژ.بەرپەڕی |
| --- | --- |
| چەوانیا ڤەکرنا پرۆگرامێ Microsoft Excel | ٥ |
| شەریتا کەرەستێن پیڤەری (ستاندەرد) Standard Toolbar | ١١ |
| پشکێن Format Cells | ١٥ |
| شەریتا لیستەیان Menu Bar – لیستەیا File | ٣٠ |
| لیستەیا Edit | ٤٤ |
| لیستەیا View | ٥٠ |
| لیستەیا Insert | ٥٢ |
| لیستەیا Format | ٦٦ |
| لیستەیا Tools | ٧٣ |
| لیستەیا Data | ٧٥ |
| لیستەیا Window | ٨٤ |
| چەوانیا ئەنجامدانا کردارێن (کومکرن، ژێبرن، لێگدان، دابەشکرن)ێ | ٨٥ |
| بکارئینانا ئایکۆنێ نەخشەیان fx | ٨٨ |
| ئارمانجا مەبەست Goal Seek | ١٠٣ |
| راهێنان | ١٠٦ |

# پێشگوتن

هونەرێ کۆمپیوتەری ئەڤرو براستی بوویە زانستێ سەردەمی و هەڤچەرخ دبوارێ ب کارئینانا وی و پێدڤی یا مە بۆ وی، هەمی بیاڤێن ژیانا مە یا روژانە ڤەگرتیە وژبلی وێ چەندێ کو کۆمپیوتەر تێکەلێ سنورێن هەمی زانستێن مروڤایەتیێن دی تر بوویە ، هەر ژ نوژداری و بیرکاری.... هتد.

مفا وخزمەتا کۆمپیوتەری بوویە پێناسەیا راستەقینەیا پەیوەندییێن دناڤبەرا ڤی ئامیرەی و جڤاکێ مرۆڤایەتی دا. ئەگەر مە ئەو ئاست و هەستێ نەتەوەیی هەبیت دوور ڤێ زانستی، کو بشێین دناڤ وەلاتێن دی یێن جیهانێدا ببیتە پێشەنگ بو بدستڤەئینانا پێشکەفتنێ و سەرکەفتنێ.

دئەڤرودا کۆمپیوتەر زمانێ نیڤ دەولەتی یێ دان وستاندنێ و سەرئێخستنا ئاستێ هشیاری یا هەمی چین و توێژێن جڤاکی ژ هەمی لایەکێ جیهانا هەڤچەرخدا بوویە پێدڤییا هەرکەسەکی و دوور ژ ڤێ هاوکێشێ، بەردەوام خەبات و بزاڤێ دکەت وهەمی شیانان دمەزێخیت هەتا بتەمامی پشت راست بیت ژ هەمی هویرییێن ڤی زانستێ گرنگ. ژبو هندێ دا ژیان و رێکا جڤاکێ خو پێ روهن بکەین ژبو خزمەتکرنا پیروزترین بوونەوەر کو ئەو ژی مرۆڤە.

# چەوانیا ڤەکرنا پرۆگرامێ

# Microsoft Excel

پرۆگرامێ مایکرۆسۆفت ئێکسل ئێکە ژ وان پرۆگرامێن گرنگ یێن دبوارێ ئامار و ژمێریاری وخشتەیاندا بکاردهێت، ئاسانکاریەکا باش بومە دکاریدا پەیدا دکەت.

## بۆ چوونا دناڤ پرۆگرامیدا ڤان رێکان دێ بکارئینین:

١- Start

٢- All Programs یان Programs

٣- Microsoft Excel یان Microsoft Office لدووڤدا Microsoft Excel،

هەر وەکو دڤی نەخشێ لخوارێ دیار کری.






# ڕوویێ پرۆگرامی




## ١- Title Bar شەریتا ناڤ ونیشانان:-




ل ئالییێ سەری یێ ڕوویێ پرۆگرامی ناڤێ پرۆگرامی و ناڤێ فایلێ کار لسەر دهێتە ئەنجامدان دیار دبیت وهەروەسا ئایکۆنێن هەرسێ فەرمانێن (Close, Maximize, Minimize) دیارن.

Minimize بۆ بچووککرنا پەنجەرا پرۆگرامی کو ببیتە دوگمەیەك لسەر (Taskbar)ێ، ئەڤ بچووککرنە بۆ ماوەیەکێ کورتە ولهەر دەمێ ئەم ڤێ دوگمێ کلیك بکەین پەنجەرا پرۆگرامی بۆ شێوێ بەری بچووککرنێ دهێتە زڤراندن.

Maximize بۆ مەزنكرنا پەنجەرا پرۆگرامى كو هەمى قەبارێ مۆنيتەرى بگريت.

هەروەسا ئەڤ ئايكۆنە وناڤێ وى ئێكسەر دێ هێتە گوهۆڕين بۆ:-

Restore Down بۆ ڤەگەراندنـــا پەنجەرا پرۆگرامى بۆ شـێوى بــەرى مەزنكرنێ دهێتە بكارئينان.

Close بۆ گرتنا پرۆگرامى دهێتە بكارئينان.

## ٢- Menu Bar شەريتا ليستەيان:




ئەڤ شەريتە كو ناڤێ ليستەيان لسەر ديار دبيت پێك هاتيە ژ ليستەيێن:-

(File, Edit, View, Insert, Format,Tools, Data, Window, Help)

وهەر ليستەيەك كومەكا فەرمانێن جۆرە وجۆر بخوڤە دگريت.

## ٣- Toolbars شەريتێن فەرمانان:



شەريتێن فەرمانان هەر ئێك ژ چەند ئايكۆنان پێك دهێتن وهەر ئايكۆنەكى وێنەيەكێ تايبەت هەيە وبۆ مەرەمەكا تايبەت بكاردهێتن، ناڤێن خۆ يێن تايبەت هەنە وفەرمانێن جۆرا وجۆرن بۆ ئەنجامدانا هەر كريارەكێ.

لدووف حەزا مە دشياندايە ژمارەيێن شەريتان و ئايكۆنێن وان بگوهۆڕين.

**٤- ناڤێن ستووينان:**

| A | B | C | D | E | F | G | H |
|---|---|---|---|---|---|---|---|

هەر بەرپەڕەكێ پرۆگرامێ( ئێكسلێ ٢٠٠٣) ژ (٢٥٦) ستووينان پێك دهێت و برێيا پيتێن ئينگليزى هاتينە ناڤكرن.

(A,B,C…Z,AA,AB…AZ,BA,BB,…BZ,…………IV)

٥-ناڤێن ريزەيان :- ريزێن هەر بەرپەڕەكێ پرۆگرامى (٦٥٥٣٦)ن، وبرێيا ژمارەيان هاتينە ناڤكرن.

(1,2,3,……….63535,65536)

دڤى پرۆگراميدا فايل بناڤێ (پەرتووك Book) دهێتە ناڤكرن و هەر پەرتووكەك ژ كومەكا بەرپەڕان (Sheet) پێك هاتيە كو ئەم دشێن ژ (١ تا ٢٥٥) بەرپەڕان (Sheet)ان لسەر هەر پەرتووكەكێ (Book) دانين.

بڤى شێوێ لخوارێ ديار كرى دەست نيشانكرنا ژمارەيا شيتەيان (Sheet) دناڤ پەرتووكێدا (فايليدا) دهێتە ئەنجامدان.

١-tools

٢-Options

٣-General



ژمارا شيتێن پێدڤى دێ نڤيسين وكليكى لسەر (OK) دكەين.

٦- **خانە Cell:-** هەر وەکو هاتیە دیار کرن کو ستووینان و ڕێزان ناڤێن خۆ یێن تایبەت هەنە بهەمان شێوە هەر خانەیەکێ ناڤێ خۆ یێ تایبەت هەیە، ودهێتە ناڤکرن برێیا ناڤێ ستووینێ وناڤێ ڕێزا دناڤدا، بو نموونە ئەو خانەیا دناڤ ستووینا ( E ) وریزا (٨) بیت ناڤێ وێ (E8)ە، یان ئەو خانەیا دناڤ ستووینا (G) ول ریزا (٢٠)ێ بیت دبێژنێ (G20)... هتد.

٧- **Name Box:-** هەمی خانە برێیا ناڤێ ستووینی و ژمارەیا ڕێزێ دهێنە ناڤکرن، ل هەر جهەکێ ئەم دەست نیشانبکەین یا ن هەر خانەیەکا ئەم چالاکبکەین دناڤ (Name Box)ێدا ناڤێ وی دهێتە دیارکرن.

٨- **شەریتا هاوکێشەیان Formula Bar:-** لدەمێ هەر هاوکێشەیەکا بیرکاریێ دناڤ خانەیەکێدا بکاربینین و وێ خانێ دوی ماوەیدا یان دماوەیکێ دیدا دەست نیشانبکەین یان چالاکبکەین دناڤ ڤێ شەریتێدا ئەو هاوکێشە دهێتە بەرچاڤکرن ودشیاندایە گوهۆڕینا لسەر بکەین.

**نموونە:**

ئەگەر دخانەیەکێدا کردارا (=A1+B2) هاتبیتە ئەنجامدان و لێ ئەگەر مەڤیا ئەنجامێ کومکرنا خانەیا (A1) دگەل خانەیا (B3) ئەنجام بدەین، ئەو ژی پشتی ئەم خانەیا کردارا خۆ چالاك بکەین، ئێکسەر دێ لسەر شەریتا هاوکێشەیان (B2) گوهۆڕین بۆ (B3) بڤێ چەندێ کردار دێ بدوماهیك هێت.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

❊ ❊ ❊ ❊

❊

## شەریتا کەرستێن پیڤەری (ستاندەرد) Standard Toolbar



| | | |
|---|---|---|
| فایلەکێ نوی Ctrl+N | | New |
| ڤەکرنا فایلەکێ ڤەگرتی Ctrl+O | | Open |
| ڤەگرتن Ctrl+S | | Save |
| لێگەریان Ctrl+F | | Search |
| چاپکرن Ctrl+P | | Print |
| بەرچاڤکرن لبەری چاپکرنێ Ctrl+F2 | | Print Preview |
| چاککرنا هەڵەیێن زمانی ورێنووسی F7 | | Spelling |
| برین Ctrl+X | | Cut |
| کۆپیکرن Ctrl+C | | Copy |
| نیساندن Ctrl+V | | Paste |
| هەلگرتنا (وەرگرتنا) خسلەتێن خانەیێ | | Format Painter |
| لێ زڤرین ژ پێنگاڤا دوماهیێ Ctrl+Z | | Undo |
| ڤەگەریان بۆ پێنگاڤا ئەم لێ زڤرین | | Redo |
| ئینانا لینکەکێ Ctrl+K | | Hyperlink |
| کومکرن | | Auto Sum |

| Sort Ascending | | بۆ ڕیزکرنا ژمارەیەیان ژ بچووك بۆ مەزن و ڕیزکرنا پیتەیان ژ (أ) بۆ (ی) و ژ(A) بۆ (Z) |
|---|---|---|
| Sort Descending | | بۆ ریزکرنا ژمارەیەیان ژ مەزن بۆ بچووك و ریزکرنا پیتەیان ژ (ی) بۆ (أ) و ژ(Z) بۆ (A) |
| Char Wizard | | بۆ درۆستکرنا نەخشەیان(هێکاران) |
| Drawing | | بەرچاڤکرنا شەریتا کەرەستێن وێنەکێشانێ |
| Zoom | 100% | بۆ بەرچاڤکرنا نڤیسینێ بشێوێ دوویر یان نێزیك |
| Help | | هاریکار F1 |

# شەریتا کەرەستێن گونجاندنێ Formatting Toolbar




| | | |
|---|---|---|
| 1 | Font | شێوازێ فۆنتێ نڤیسینێ |
| 2 | Font Size | قەبارێ فۆنتێ نڤیسینێ |
| 3 | Bold | تۆخکرنا نڤیسینێ |
| 4 | Italic | خوارکرنا نڤیسینێ |
| 5 | Underline | بۆ دانانا هێلەکێ (خیچەکێ) لژێر نڤیسینێ |
| 6 | Align Left | بۆ گوهۆڕینا ئاراستێ نڤیسنێ دخانەیدا بۆ لایێ چەپێ یێ خانێ |
| 7 | Center | بۆ گوهۆڕینا ئاراستێ نڤیسنێ د خانەیدا بۆ ناڤەڕاستا خانێ |
| 8 | Align Right | بۆ گوهۆڕینا ئاراستێ نڤیسنێ د خانەیدا بۆ لایێ ڕاستێ یێ خانێ |
| 9 | Merge | بۆ تێکهەلکرنا خانەیان ب ئێك خانە |
| 10 | Sheet Right to Left | ئاراستێ بەربەڕێ ژلایێ ڕاستێ بۆ چەپێ |
| 11 | Currency Style | بۆ دانانا هێمایێ پارەی (دراڤی) |
| 12 | Percent Style | بۆ ئەنجامدان ودانانا ڕێژەیا سەدی |
| 13 | Comma Style | بۆ دانانا بێهنوکێ (فاریزە) |

| 14 | Increase Decimal | بۆ زێدەکرنا خانەیێن لدووڤ پوینتان |
|---|---|---|
| 15 | Decreas Decimal | بۆ کێمکرنا خانەیێن لدووڤ پوینتان |
| 16 | Decrease ... | بۆ کێمکرنا پەراوێزا نڤیسنییێ د خانەیدا |
| 17 | Increase ... | بۆ زێدەکرنا پەراوێزا نڤیسنییێ د خانەیدا |
| 18 | Outside | بۆ دانانا چوار چوڤێن خانەیان |
| 19 | Highlight | ڕەنگکرنا تەختێ نڤیسینێ |
| 20 | Font Color | بۆ هەلبژارتنا ڕەنگێ نڤیسینێ |

**تێبینی:**

١- بەری دەست پێکرنا کاری دناڤ پرۆگرامیدا پێدڤیە ئاراستەیێ نڤیسینێ دناڤ بەرپەڕیدا دیار بکەین ئەوژی ژلاییێ چەپێ بۆ راستێ یان بەرۆڤاژی برێیا (Sheet Right to Left) .

٢- بۆ نڤیسینێن کوردی وعەرەبی دناڤ خانەیاندا ئایکۆنێ (Right to Left) دناڤ شەریتا گونجاندنێ بکاردئینین، بەلێ بۆ نڤیسینێن ئینگلیزی ئایکۆنێ (Left to Right) بکاردئینین.

## پشکێن Format Cells

### ئێک: Border

ئەو هێلێن (خیچێن) دەردکەڤن ل دەستپێکا ڤەکرنا پرۆگرامیدا دناڤ چاپکرنێدا دەرناکەڤن ئانکۆ هێلێن خەیالی (ئاشوپی ) نە (Grid Line)، ئەگەر مە بڤێت خشتەیەکی دروست بکەین پێدڤییە چوارچوڤێ خشتەی برێیا پشکا (Border) دەست نیشانبکەین، بۆ ئەنجامدانا ڤی کاری ڤان رێکان دێ بکارئینین:-

١-ژمارا ستووین و ریزان دێ دەست نیشانکەین ئانکو (Select)دکەین.

٢-لیستا Format دێ ڤەکەین.

٣-کلیکەکێ لسەر (Cells) دکەین.

٤-بەربەرێ (Border) کلیکدکەین.



ئەڤجا برێیا کلیکا دەستێ چەپێ یێ ماوسی لسەر (Outside و Inside) ولدووڤدا (Ok) کلیکدکەین




**نموونە:**

ئەگەر مە بڤێت خشتەیەکێ مە ژ پێنج رێزان و چوار ستووینان پێك بهێت، دڤیت هەتا رێزا پێنجی و ستووینا چوارێ دەست نیشانبکەین، لدووڤدا کردارا درۆستکرنا خشتەی ئەنجام ددەین وەکو لسەری ئاماژە پێ هاتیە کرن، بڤی شێوەی دشیاندایە خشتەیان درۆستبکەین.

**تێبینی:**

١- بۆ ژێبرنا چوارچۆڤ وهێلێن دناڤ خشتەیدا (None) بکاردئینین.

٢- بۆ گوهۆڕینا شێوازێ هێلان، پشکا (Style) بکاردئینین.

٣- بۆ گوهۆڕینا رەنگێ هێلان، پشکا (Color) بکاردینین.



## دوو: Patterns

لدەمێ مەبقێت ناڤەندا خانەیان رەنگبکەین، دێ بڤی شێوەی ئەنجامدەین:-




جارا ئێکێ خانەیان دەست نیشاندکەین لدووڤدا دناڤ بۆکسا Format Cells دا دێ چینە بەرپەرێ Patterns ودناڤ Cell Shading دا دێ کومەکا رەنگان بینین، کلیکێ لسەر ئێك ژ رەنگان دکەین لدووڤدا کلیکێ لسەر (Ok) دکەین دێ بینین رەنگێ وان خانەیێن دەستنیشانکری هاتە گوهۆڕین بۆ رەنگێ مە هەلبژارتی.

ئەگەر مە بڤێت زەخرەفەیەکێ دناڤ ڤان رەنگاندا دیاربکەین دهەمان بەرپەڕیدا لاکێشەیەك هەیە بناڤێ (Patterns) دێ کلیککەین ئێکسەر چەند جۆرێن زەخرەفا بەرچاڤدبن دشیاندایە ئێکێ هەلبژێرین، ئەگەر پەشێمانبوویین لسەر دانانا رەنگان وزەخرەفەیان بهەمان شێوە دێ خانەیان دەستنیشانکەین وپاشان دناڤ بەرپەڕێ Pattern دا دێ (No Color) هەلبژێرین وکیلکێ لسەر (OK) دکەین دێ بینین رەنگێ وێ نەمایە.



## سێ: Font

دناڤ خشتێ مەبەستدا پێدڤییە ڕەنگ و قەبارە وجۆرێ نڤیسینا مەبڤێت بهێتە دیار کرن، بۆ ڤێ چەندێ دشیاندایە دناڤ Format Cells دا بچینە پشکا (Font) دناڤ بەرپەڕێ (Font) دا وجۆرێ فونتێ پێدڤی هەلبژێرین وهەرووەسا دهەمان بەرپەڕیدا دناڤ پشکا (Color)دا ڕەنگێ نڤیسنییێ ودناڤ پشکا (Size)دا قەبارێ نڤیسینێ هەلبژێرین.



ئەگەر مەبڤێت هێلەك دناڤەندا نڤیسینێدا بهێتەدیار کرن، دهەمان بەرپەڕیدا ودپشکا (Effect)دا دێ کلیکێ لسەر (Strike through) کەین.

دێ بینین دناڤەراستا نڤیسینا دەستنیشانکریدا هێلەك دهێتە کێشان وەکو ڤێ نموونێ:-

بڤی شێوەی خشتەی دروست دکەین:

| F | E | D | C |
|---|---|---|---|
| | | تێبینی | کار |
| | | | دکتور |
| | | | ماموستا |
| | | | ئەندازیار |
| | | | ئەندازیار |
| | | | دکتور |
| | | | ماموستا |
| | | | ماموستا |
| | | | ماموستا |

لدەمێ مەبڤێت ئەم توانا (هێزا) بۆ ژمارەیان یان پیڤەران دیار بکەین بۆ نموونە نڤیسینێن (م$^{٢}$ یان ٦$^{٢}$ یان ٨$^{٢}$ ...هتد ) بۆ ڤێ چەندێ دناڤ پرۆگرامێ ئێکسلیدا پشتی نڤیسینا ژمارێ یان پیتێن پیڤەری دێ ژمارا توانێ (هێزێ) دەست نیشانکەین ودناڤ بەرپەڕێ (Font) دا دێ (Superscript) هەلبژێرین وپاشی دێ کلیکێ لسەر (OK) کەین.

لدمیَ ئەم پیَدڤی بووین بۆ نڤیسینیَن وەك ($H_2O$) دیَ نڤیسینا دکەڤیتە خواریَ دەست نیشانکەین ودهەمان بەرپەڕیدا دی (Subscript) هەلبژیَرین ولدووڤدا دیَ کلیکیَ لسەر (OK) کەین.

## چۆڕ: Alignment

ئەگەر مە بڤێت ناڤ ونیشانێن خشتەیان ژ ئالیێ ناڤەراستا خانەیاندابیت یان ژ سەری بۆ بنی یان بەروڤاژی بهێنە نڤیسنی، دشیاندایە وان خانەیان دەستنیشانبکەین ودناڤ بۆکسا (Format Cells) دا بەرپەڕێ (Alignment) ڤەکەین، لوێرێ ئەگەر مە بڤێت سەمتا نڤیسین ژ سەری بۆ خوارێ بیت دوی دەمیدا ل پشکا (Orientation) دا دێ پلەیێ (Degree) کەینە (٩٠) پاشان دێ کلیکێ لسەر (OK) کەین.

دێ بینین نڤیسینا مە ژ سەری بۆ خوارێ یە ، ئەگەر مە بڤێت سەمتا نڤیسینێ ژ خوارێ بۆ سەری بیت ل پشکا Orientation دا دێ پلەیێ (Degree) کەینە (-٩٠) پاشان دێ کلیکێ لسەر (OK) کەین، لدووڤدا دێ بینین نڤیسینا مە ژ خوارێ بۆ سەری هاتیە. لدەمەکی کو رووبەرێ خشتەی مەزن دبیت دشیاندایە لدووڤ حەزا مە جهێ نڤیسینا خۆە دیاربکەین.

**نموونە:**

| زنجیرە | ناڤێ ئامیرەی |
|---|---|
| ١ | کۆمپیوتەر |
| ٢ | پرێنتەر |
| ٣ | سکانەر |

لدەمێ مەبڤێت نڤیسینا مە دبارێ ستووینیدا بکەڤیتە لایێ خوارێ و دبارێ ریزێدا بکەڤیتە لایێ راستێ، پشتی دیار کرنا خانەیان دێ چینە پشکا Alignment دناڤ بۆکسا Format Cells دا و دلاکێشا (Horizontal ) دا دێ (Right) هەلبژێرین و دلاکێشا (Vertical) دا دێ (Buttom) هەلبژێرین، لدووڤدا دێ کلیکێ لسەر (OK) کەین، دێ بینین بشێوێ مەبەست پێ هاتیە دیار کرن وەکو یا دیار د ڤێ نموونەییێدا:-

| سلێمانی | هەولێر |
| --- | --- |
| دهۆک | کەرکوک |

وئەگەر مە بڤێت نڤیسین بچیتە دناڤەندا خانەیاندا پێدڤییە دناڤ هەردوو لاکێشێن (Horizontal و Vertical) دا (Center) هەلبژێرین. دوی دەمیدا دێ بینین ئەو نڤیسینە دناڤەندا خانەیاندا دهێتە نڤیسین هەر وەکو دیار دنموونەیا خوارێدا.

پرۆگرامێ
مایکرۆسۆفت ئێکسل

| سلێمانی | کەرکوک |
| --- | --- |
| هەولێر | دهۆک |

**ئەگەر** مە بڤێت نڤیسینا خۆ دناڤ وێ خانێدا دابەشکەین لسەر دوو رێزا یان زێدەتر وبۆ ڤێ چەندێ دێ بڤی کاری رابین:-

خانەیێ دەستنیشاندکەین و دناڤ Format Cells دا دێ چینە بەرپەڕێ Alignment ودناڤ پشکا Text Control دێ (Warp text) ئەکتیڤکەین (کلیککەین) لدووڤدا دێ کلیکێ لسەر دۆگما (OK) کەین، ئێکسەر نڤیسینا وان خانەیان دێ لدووڤ قەبارێ خانەیێ هێتە دابەشکرن لسەر رێزان. وئەگەر مەبڤێت نڤیسینا خانەیێ بتنێ لسەر ئێك رێز بهێتە نڤیسین بێی کو دەستکاریێ دقەبارێ خانێدا بکەین بۆ ڤێ چەندێ دهەمان پشکا Control text دا دێ (Strick to Fit) ئەکتیڤکەین ولدووڤدا دێ کلیکێ لسەر (OK) کەین، دێ بینین کو نڤیسینا مە هاتە بچووککرن لدووڤ قەبارێ خانەی وهیچ نڤیسین نەچوویە لسەر رێزەکا نوی یان دەرڤەی خانەی. وئەگەر مە بڤێت دوو خانەیان لێکبدەین ئانکۆ هیچ هێل دناڤبەرا واندا نەمینن دێ وان خانەیان دەستنیشانکەین ودناڤ پشکا Control Text دا دێ Merge Cells ئەکتیڤکەین و دێ کلیکێ لسەر(OK) کەین، دێ بینین ئەو خانەیێن دەست نیشانکری بووینە ئێك خانە.

## پێنج: Number

**ئەڤ فەرمانە پێک دهێت ژ:-**

١-General: بۆ نڤیسین بشێوەیەکی گشتی دهێتە بکارئینان.

٢-Number: بۆ ژمارەیان دهێتە بکارئینان و پێکدهێت ژ:-

أ-Decimal Places: بۆ دیارکرنا ژمارا خانەیێن پشتی پوینتێ.

ب-(,) Use 1000 Separator: بۆ ژێك جۆداكرنا ژمارەیان (سێ سێ).

٣-Currency: بۆ دراڤی دهێتە بکارئینان وپێکدهێت ژ:-

أ-Decimal Places: بۆ دیارکرنا ژمارا خانەیێن پشتی پوینتێ.

ب-Symbol: بۆ هەلبژارتنا هێمایێ پارەی.

٤-Accounting: تایبەتە بکارێن ژمێریاری وژڤان لقان پیکدهێتن:-

أ-Decimal Places: بۆ دیارکرنا ژمارا خانەیێن پشتی پوینتێ.

ب-Symbol: بۆ هەلبژارتنا هێمایان بکاردهێت.

٥-Date: بۆ چەوانیا نڤیسینا بەرواران دهێتە بکارئینان وژڤان لقێن ل خوارێ پێکدهێت:-

أ-Type: د ڤێ لقێدا دیارکرنا بەرواران لدووڤ وەلاتەکی دهێتە دیارکرن.

ب-Locate(Location): دڤێ لقێدا شێوازێ نڤیسینا بەرواران دیاردکەین

٦-Time: بۆ چەوانیا نڤیسینا دەمان دهێتە بکارئینان وژڤان لقێن ل خوارێ پێکهاتیە:-

أ-Type: د ڤێ لقێدا دیارکرنا دەمی لدووڤ وەلاتەکی دهێتە دیارکرن.

ب-Locate(Location): دڤێ لقێدا شێوازێ نڤیسینا دەمان دیاردکەین

٧-Percentage: تایبەتە بۆ دیار کرنا هێمایا رێژەیا سەدی لدووڤ ژمارەیێدا و ل پشکا (Decimal Place) دا دێ ژمارەیا خانەیێن لدووف پوینتێ دیارکەین.

٨-Fraction: دهێتە بکارئینان بۆ گوهۆڕینا کەرتێن دەهی بۆ کەرتێن ئاسایی.
و دناڤ پشکا Type دا شێوێ کەرتی دیار دکەین

٩-Scientific: ئەڤ لقە دهێتە بکارئینان بۆ گوهۆڕینا شێوازێ ژمارەیان ژ شێوازێ (ئاسایی) بۆ شێوازێ (زانستی) و دناڤ پشکا (Decimal Place) دا ژمارەیا خانەیێن لدووڤ پوینتێ دیار دکەین.

١٠-Text: دڤێ لقێدا دشیاندایە نڤیسینان بشێوەیەکێ گشتی بنڤیسین.

١١-Special: بۆ نڤیسینا (کۆدان یان ژمارەیێن تەلەفونان یان ئیمێلان یان ژمارەیێن دابینکرنا کۆمەلایەتی)بکاردهێت، و ژ ڤان هەردوو لقان پێك دهێت:-

أ-Type: دڤێ لقێدا (کۆد یان ژمارەیێن تەلەفونێ یان ئیمێلان یان ژمارەیێن دابینکرنا کۆمەلایەتی) دیار دکەین.

ب-(Locate(Location: دڤێ لقێدا جۆرێ نڤیسینا (کۆد یان ژمارەیێن تەلەفونێ یان ئیمێلان یان ژمارەیێن دابینکرنا کۆمەلایەتی) لدووڤ وەلاتان دیاردکەین.

١٢-Custom: ئەڤ لقە دهێتە بکارئینان بۆ نڤیسینا دەم وبەراوارن لدووڤ حەزا بکارئێنەرێ پرۆگرامی

و دناڤ پشکا Type دا شێوازێ نڤیسینا (دەمی یان بەرواری) دهێتە دیارکرن.

# شەریتا لیستەیان Menu Bar

## ئێك: لیستەیا File




**New:** بڤەکرنا پرۆگرامێ ئێکسلیدا ئێکسەر پەرتووکەك(Book)ەکا نوی بەرچاڤدبیت ودشیاندایە کاری لسەر بکەین، یان ئەگەر ئەم کاری لسەر پەرتووکەکێ ئەنجام بدەین و دحەزا مەدا بیت ئێکسەر پەرتووکەکا نوی ڤەکەین دێ چینە لیستەیا (File) فەرمانێ (New) کلیکدکەین، یان لسەر شەریتا کەرستێن پیڤەری (ستاندەرد) ئایکۆنێ (New) کلیکدکەین وهەروەسا بریێا دۆگمێن کیبۆردی (Ctrl+N) پەرتووکەکا نوی دهێتە بەرچاڤکرن ودشیاندایە کاری لسەر ئەنجام بدەین.

**Open:** بریێا ڤی فەرمانی دشیاندایە ئەو پەرتووکێن بەری نهو هاتینە ڤەگرتن دناڤ کۆمپیوتەریدا یان دناڤ هەر یەکەیەکا ڤەگرتنێدا بەرچاڤبکەین وگۆهورانکاریان لسەر ئەنجام بدەین.




١-دهێته بكارئینان بۆ دیار كرنا ئەو جهێ (درایف + فولدەر) پەرتووك دناڤدا هاتیە ڤەگرتن.

٢-دهێته بكارئینان بۆ دیاركرنا ناڤێ پەرتووكا مە بڤێت ناڤەروكا وێ بەرچاڤبكەین.

**Close:** بۆ گرتنا پەرتووكا ڤەكری.

**Save:** ئەم پشتی پەرتووكەكا نوی ڤەدكەین ودناڤدا دنڤیسین وبۆ پاراستنا ناڤەرۆكا وێ بۆ ماوەیەكێ درێژ پێدڤییە ئەڤ پەرتووكە بهێتە ڤەگرتن دناڤ كۆمپیۆتەریدا و ب ڤی شیوەی:-

لدەسپێكێ پشتی ئامادەكرنا پەرتووكا نوی دێ چینە سەر لیستەیا File ولدووڤدا دێ Save كلیك كەین یان لسەر شەریتا پیڤەری (ستاندەرد) دێ ئایكۆنێ Save كلیك كەین یان ب رێیا كیبوردی دێ (Ctrl+s) كلیك كەین، دایلوك بۆكسەك دێ بەرچاڤبیت.

د ڤێ دایلۆك بۆكسێدا ودناڤ خانەیا (Save In) دا دێ جهێ لێ ڤەدگرین (درایف + فولدەر) دیار کەین وهەر وەسا دخانەیا (File Name) دا دێ ناڤەکی بۆ پەرتووکێ (فایلی) دانین، لدووڤدا کلیکێ لسەر دوگما Save دکەین یان لسەر کیبۆردی دوگما (Enter) بکاردئینین بڤی شێوەی پەرتووك (فایل) دهێتە ڤەگرتن ودشیاندایە هەر دەمێ مەبڤێت ناڤەرۆکا وێ بەرچاڤبکەین وگوهۆڕینا لسەر ئەنجام بدەین وڤەگرینە ڤە.




**تێبینی:**

لدەمێ ئەم پەرتووکەکا (فایلەکێ) نوی ئامادەدکەین و ئەم هەولبدەین پرۆگرامی یان پەرتووکێ بگرین کۆمپیۆتەر دێ برێیا نامەیەکێ ئاگەهداریا مە کەت (ئایا ئەو گۆرانکاریێت لسەر پەرتووکێ (فایلی) هاتینە ئەنجام داین بهێنە ڤەگرتن یان نە؟) بۆ ڤێ چەندێ ئەگەر مە دوگما (Yes) کلیککر دێ ئێکسەر دایلۆك بۆکسا ڤەگرتنێ (Save) بەرچاڤبیت وناڤەکی دێ بۆ دانین وڤەگرین.

**Save As:** بۆ ڤەگرتنا ئەو فایلێن (پەرتووکێن) بەری نهو نە هاتینە ڤەگرتن یان ژی بۆ ڤەگرتنا پەرتووکەکا ڤەگرتی بناڤەکێ نوی دهەمان جهدا یان لجهەکێ دی دهێتە بکارئینان.

**Save as Web Page:** ڤەگرتنا فایلی وەك بەرپەڕەکێ وێب کە وەکو بەرپەڕەکێ ئینتەرنێتێ وبڤی شێوازی دهێتە بەرچاڤکرن لدەمێ ڤەکرنێدا



**Search:** بۆ لێگەریان لسەر ئەو فایلێن ئێکسلی ئەوێن پێش وەخت هاتینە ڤەگرتن وجهێ وان لدەڤ مە د دیار نەبن دهێتە بکارئینان.

## Page Setup: ئامادەكرنا بەرپەڕی

دەمێ ئەم لسەر پرۆگرامێ ئێكسليدا كاردكەين وەكو هندێيە كو رووبەرەكی مەزندا كاربكەين ژ ئەگەرێ زۆريا ژمارەيا رێزان وستووينان، برێيا فەرمانێ Page Setup دشياندايە وی بەرپەڕی ئامادەبكەين وە چاپ بكەين لدووف پەراوێز وقەبارەی بەرپەڕی.

پشتی كليككرنا فەرمانێ Page Setup ئەڤ دايلۆك بۆكسا لخوارێ ديار دبيت كو پێك دهێت ژڤان پشكان:-



**نێک**: Page ئەڤ پشکە پێکدهێت ژڤان لقان:-




١-Portrait: ئەگەر مە بڤێت بەرپەڕ دبارێ ستووینیدا بیت  دێ ڤێ لقێ ئەکتیڤکەین

٢-Landacape: ئەگەر مە بڤێت بەرپەڕ دبارێ پانیاییدا بیت  دێ ڤێ لقێ ئەکتیڤکەین

٣-Adjust to: دهێتە بکارئینان بۆ بچووککرن ومەزن کرنا زانیاریان لسەر بەرپەڕێ چاپکرى.

٤-Fit to: بۆ دابەشکرنا زانیاریان لسەر بەرپەڕەکی یان چەند بەرپەڕان یان ئینانا زانیارییێن چەند بەرپەڕان بۆ ئێك بەرپەڕ دهێتە بکارئینان.

٥-Paper Size: بۆ دیارکرنا قەبارێ بەرپەڕی دهێتە بکارئینان.

٦-Print Quality: بۆ دیارکرنا جۆرێ چاپکرنێ ژ ئالیێ ووردبینێ ڤە دهێتە بکارئینان.

پشتی ئەم لقان دەستنیشاندکەین لدووف پێدڤیيا مە دێ کلیکەکێ لسەر (OK) دەین ئەڤجا دهێته جێبەجێکرن.

**دوو**:Margins: دهێته بکارئینان بۆ دیار کرنا پەراوێزێن هەر چۆار لایێن بەرپەڕی هەر وەکو لخۆارێ دیار کری.



١-Top: بۆ دانانا پەراوێزا سەرێ بەرپەڕی.

٢-Bottom: بۆ دانانا پەراوێزا ژێریا بەرپەڕی.

٣-Right: بۆ دانانا پەراوێزا لایێ راستێ یێ بەرپەڕی.

٤-Left: بۆ دانانا پەراوێزا لایێ چەپێ یێ بەرپەڕی.

٥-Header: بۆ دانانا پەراوێزا نڤیسینا لسەرێ هەمی بەرپەڕان دهێته نڤیسین.

٦-Footer: بۆ دانانا پەراوێزا نڤیسینا لژێریا هەمی بەرپەڕان دهێته نڤیسین.

٧-Horizontal: بۆ وێ چەندێ کو نڤیسینا مە ژ ئالییێ ئاسوییدا بکەڤیتە ناڤەراستا بەرپەڕی دهێتە بکارئینان.

٨-Vertical: بۆ وێ چەندێ کو نڤیسینا مە ژ ئالییێ ستووینیدا بکەڤیتە ناڤەراستا بەرپەڕی دهێتە بکارئینان.

هەروەسا پشتی ڤان لقان دەستنیشاندکەین دێ دوگما (OK) کلیککەین ئەڤجا دهێنە جێبەجێکرن.

سێ:Header/Footer: ئەڤ پشکە ژ ڤان لقان پێك دهێت.

١-Header: دڤێ لقێدا کومەکا نڤیسینێن ئامادەکری هەنە وهەر ئێکا دهێتە دەست نیشانکرن دێ بشێوەیەکێ ئوتوماتیکی لسەرێ هەمی بەرپەڕان دووبارە بیت.

٢-Custom Header: دڤێ لقێدا دشیاندایە لدووڤ حەزا مە نڤیسینان بنڤیسین یان وێنەیان دانین بۆ وێ چەندێ کو لسەرێ هەمی بەرپەڕان بهێنە دووبارە کرن.







٣-Footer: د ڤێ لقێدا کومەکا نڤیسینێن ئامادەکری هەنە وهەر ئێکا دهێتە دەستنیشانکرن دێ بشێوەیەکێ ئوتوماتیکی لژێربا هەمی بەرپەڕان دووبارە بیت.

٤-Footer Header: د ڤێ لقێدا دشیاندایە لدووف حەزا مە نڤیسینان بنڤیسین یان وێنەیان دانین بۆ وێ چەندێ کو لبنێ هەمی بەرپەڕان بهێنە دووبارە کرن.

پشتی ڤان لقان دەستنیشاندکەین دێ دوگما (OK) کلیککەین.

**چۆار**: Sheet: ئەڤ پشکە ژڤان لقان پێکهاتیە:-




١-Print area: ئەگەر مە بڤێت بتنێ نڤیسینەك یان پشکەکا دەستنیشانکری چاپکەین دێ برێیا ڤێ لقی ئەنجامدەین.

٢-Rows to Repeat at top: دهێتە بکارئینان بۆ دەستنیشانکرنا ناف ونیشانێن خشتەیان کو بشێوەکێ ئوتوماتیکی لسەر خشتەی لهەمی بەرپەڕان بهێتە چاپکرن.

٣-Colum to repeat at top: دهێتە بکارئینان بۆ دووبارەکرنا ناف ونیشانێن ستوینێن خشتەی کو لهەمی بەرپەڕان بهێتە چاپکرن.

٤-Gridline: بۆ دیار کرنا هێلێن (خیچێن) ئاشوپی  یێن پرۆگرامێ ئێکسلی لدەمێ چاپکرنێدا دهێتە بکارئینان.

٥-Black and White: ئەگەر مە بڤێت خشتە بشێوەیەکێ رەش وسپی بهێتە چاپکرن دێ ڤێ لقی ئەکتیڤکەین.

٦-Draft Quality: بۆ چاپکرنا خشتەی وەکو رەش نڤیسەك دهێتە بکارئینان.

٧-Row and Column Heading: ئەگەر مە بڤێت ناڤ ونیشانێن ستووینان و ژمارەیێن رێزان بەرچاڤبکەین لدەمێ چاپکرنێدا دێ ڤێ لقێ ئەکتیڤکەین.

٨-Comments: بۆ دیار کرنا تێبینییێن هاتینە دانان بۆ خانەیان لدەمێ چاپکرنێدا دهێتە بکارئینان.

٩-Over then Down ، Down then Over:





ئەگەر دبەرپەرکیدا خشتەیەکێ درێژ یان چەند خشتە هاتبنە ئامادەکرن، برێیا ڤێ لقێ دێ رێزبەندیا دابەشکرنا خشتەی لسەر بەرپەران دیار کەین.

پشتی دەستنیشانکرنا ڤان لقان دێ دۆگما (OK)کلیککەین.

## :Print Preview

Print Preview: بۆ بەرچاڤکرنا بەرپەڕان بەری چاپکرنێ دهێتە بکارئینان وبکلیککرنا (Close) دێ زڤرینە بارێ ئاسایێ یێ فایلی.

:Print بۆ چاپكرنا بەرپەڕان دهێتە بكارئینان وپێكدهێت ژڤان لقێن لخوارێ دیار كری:-




أ-Name: ئەڤ پشكە بۆ دەستنیشانكرنا ناڤێ ئامیرێ چاپێ (Printer).

ب-All: بۆ چاپكرنا هەمی بەرپەڕێن (sheet)ی دهێتە بكارئینان.

ج-Pages: بۆ دەستنیشانكرنا ژمارەیێن بەرپەڕێن دهێنە چاپكرن وەكو نموونە (٣-٦) چاپكرنا بەرپەڕێن (٣) تا (٦) دهێتە بكارئینان.

د-Selection: بۆ چاپكرنا ئەو پشكا هاتیە دەست نیشانكرن دناڤ بەرپەڕیدا.

هـ- Active sheet(s): بۆ چاپكرنا بەرپەڕێن (Sheets) یێن ئەكتیڤ.

و-Enter Workbook: بۆ چاپكرنا هەمی بەرپەڕێن (Sheet)ێن فایلی دهێتە بكارئینان.

ز-Number of Copies: بۆ دیارکرنا ژمارا وێنەیێن پێدڤی ژ بەرپەڕێن چاپکرنێ دهێتە بکارئینان.

ح-Collate: بۆ دیار کرنا رێزیەندیا چاپکرنا بەرپەڕان لدووڤ ژمارا بەرپەڕان یان لدووڤ دوماهیك ئینانا وێنەیێن هەر بەرپەڕەكی ئەڤ پشكە گرێدایە ب خالا (ز)ڤە.

Send to: تایبەت ب هنارتنا پەرتووكێن (فایلێن) ئێكسلی.

Properties: بۆ دیار كرنا خسلەتێن پەرتووكێ (فایلی) دهێتە بكارئینان، وەك:-

(قەبارە، ناڤێ پەرتووكێ، جهێ ڤەگرتنێ، ...هتد)

Exit: ئەڤ فەرمانە دهێتە بكارئینان بۆ دەركەفتن وگرتنا پرۆگرامی.

# Edit لیستەیا




ئەڤ لیستەیە ژ کومەکا فەرمانان پێکهاتیە وبڤی شێوەی :-

Undo: لێ زڤرین ژ پێنگاڤا دوماهیێ.

Redo: ڤەگەریان بۆ پێنگاڤا ئەم لێ زڤرین.

Cut: برین

Copy: کۆپیکرنا خانەیێن دەستنیشانکری

Paste: نیساندنا ئەو خانەیێن هاتینە برین یان کۆپیکرن

Paste Special: نیساندنا وان خانەیێن هاتینە برین یان کۆپیکرن لدووف تایبەتمەندیێن پێدڤی هەر وەکو دیار د ڤی وێنەیدا.




:Fill بۆ پركرنا كومەكا خانەیان ب پێزانێن دیار كری دهێتە بكارئینان، ئەڤ فەرمانە پێك دهێت ژ:-

:Right پركرنا خانەیان بۆ لایێ راستێ

:Left پركرنا خانەیان بۆ لایێ چەپێ

:Justify پركرن لدووڤ تایبەتمەندیێن خانەیان وەكو لێگدانا نڤیسینێن دوو خانەیان دناڤ ئێك خانەدا.

:Series پركرنا تایبەت، ئەڤەژی بۆ پركرنا بەرواران یان مەهان یان سالان ئێك لدووڤ ئێك.

:Series In پێكهاتیە ژ Rows بۆ كاری لسەر ریزان و Columns بۆ كاری لسەر ستوینان.



Clear: ئەڤ فەرمانە دهێتەبكارئینان بۆ ژێبرنا هەر گوهۆڕینەكا هاتبیتە كرن لسەر خانەیان، ب جێبەجێكرنا ڤی فەرمانی ئەو خانە دێ زڤرنە بارێ ئاسایی یێ خۆە، ئەڤ فەرمانە پێكهاتیە ژ:-

All: ژێبرنا هەمی پشكان

Format: ژێبرنا هەمی كردارێن پشكا گۆنجاندنا خانەیان وەك جۆر وشێوێ فونتی ورەنگ و چۆار چۆڤێن خانەیان وهەمی پشكێن دی یێن گۆنجاندنێ

Content Del: بتنێ ژێبرنا زانیارییێن دناڤ خانەیاندا.

Comments: ژێبرنا تێبینییێن هاتینە نڤیسین لسەر خانەیان

Delete: ژێبرن وژڤان پشكان پێكدهێت:-

Shift cells Right: ژێبرنا خانەیێن دەستنیشانكری وپالدانا وان بۆ لایێ راستێ.

Sheft cells up: ژێبرنا خانەیێن دەستنیشانكری وپالدانا وان بۆ لایێ سەری.

Entire row: ژێبرنا ڕێزان لدووڤ خانەیێن دەستنیشانكری.

Entire Column: ژێبرنا ستوینان لدووڤ خانەیێن دەستنیشانكری.

Delete Sheet: ژێبرنا بەرپەڕەكی (Sheet)ەكی ب تەمامی.

Move or Copy Sheet: ڤەگۆهاستن یان كوپیكرنا بەرپەڕەكی ودگەل جێبەجێكرنا ڤی فەرمانی دایلۆك بۆكسەك بەرچاڤدبیت، ژڤان پشكان پێكدهێت.

To Book: بۆ فایلەکێ دیارکری.

Before Sheet: دیارکرنا جهێ بەرپەڕێ دهێتە ڤەگۆهاستن یان کۆپیکرن




(جهێ وی دناڤ بەرپەڕاندا) و ل ڤێرێ‌بۆ کۆپیکرنێ پێدڤییە خانەیا Create a copy ئەکتیڤ بکەین.




Find: لێگەریان یان دیتنا زانیاریان لدەمەکێ کو زانیاری د زۆربن یان کومەکا زۆر یا ناڤان هاتینە تێئێخستن دناڤ خشتەیدا، لڤێرێ بۆ لێگەریان یان دیتنا ناڤەکی بزویترین دەم ئەڤی فەرمانی ئەنجامددەین ئەوژی بریێا نڤیسینا پەیڤان ئەم لێدگەریێن دناڤ لاکێشا Find What دا ولدووڤدا کلیکێ لسەر Find Next دکەین ئەڤجا بزویترین دەم بۆ مە دیار دبیت.

## :Replace

بۆ گوهۆڕینا پێزانینەکێ ب پێزانینەکا دی لدەمەکی ئەگەر مەبڤێت ووشەیەك یان رستەیەك ل شووینا ئێکا  دی بهێتە نڤیسین، بکلیککرن لسەر Replace دایلۆك بۆکسەك بەرچاڤدبیت ژ دوو پشکان پێکهاتیە د ڤالاهییا ئێکێدا Find What دێ وان داتایێن بهێنە گوهۆڕین نڤیسین و دڤالاهییا دوویێدا دێ وان داتایێن ل شووینا وان بهێن دێ نڤیسین ولدووڤدا کلیکێ لسەر دۆگما Replace دکەین، ئەگەر مەبڤێت هەمی دانەیێن وان داتایان ب ئێکجار بهێنە گوهۆڕین بۆ وان داتایێن نوی کلیکێ لسەر دۆگما Replace All دکەین.



:GOTO بۆ ئەکتیڤکرنا خانەیەکا دیار کری، بڕێیا ڤی فەرمانی بزویترین دەم دگەهینە خانەیا مەبەست پێ




دڤێرەدا ناڤێ خانەیا مەبەست پێ ئەکتیڤبکەین دهێتە نڤیسین ولدووڤدا کلیکێ لسەر OK دکەین.

# لیستەیا View




ئەڤ لیستە تایبەتە ب بەرچاڤکرنا روویێ فایلێن ئێکسلی و ژڤان پشکان پێك دهێت:-

**Normal:** بەرچاڤکرن ب شێوەیەکێ ئاسایی.

**Page Break Preview:** بەرچاڤکرنا ناڤەرۆکا فایلان هەر وەکی لسەر ئامیرێ چاپێ دەردکەڤیت.

**Task Pane:** بۆ بەرچاڤکرنا وێ لیستەیا ل لایێ راستێ یێ فایلی دەردکەڤیت کو دناڤدا زانیاری لسەر پەرتووکێ (فایلێ) ڤەگرتی دیار دکەت.

**Toolbar:** بۆ بەرچاڤکرن وڤەشارتنا شەریتێن کەرەستان.

**Formula Bar:** بۆ بەرچاڤکرن و ڤەشارتنا شەریتا هاوکێشەیان.

Status Bar: بۆ بەرچاڤکرن وڤەشارتنا شەریتا بارێ نوکە کو دڤێ شەریتێدا زانیاریان ددەتە مە لسەر جهێ نیشاندەری (جهێ کار لسەر دهێتە ئەنجامدان).

Header and Footer: بەحسی ڤێ پشکێ هاتیە کرن دناڤ پشکا (Page Setup) دا د لیستەیا (File)دا.

Full Screen: بەرچاڤکرن لدووڤ پرانیا شاشێ (مۆنیتەری).

Zoom: بۆ دویرئێخستن ونێزیککرن وبەرچاڤکرنا زانیاران.



# لیستەیا Insert




Cells: بۆ زێدەکرنا (داکرنا) خانەیان و ستوینان وریزان دهێتە بکارئینان، پێك دهێت ژ ڤان لقان:-

أ-Shift Cells Right: بۆ زێدەکرنا (داکرنا) خانەیەکێ ل لایێ راستێ.

ب-Shift Cells Down: بۆ زێدەکرنا (داکرنا) خانەیەکێ بۆ لایێ خوارێ.

ج-Entire Row: بۆ زێدەکرنا (داکرنا) ریزەکێ.

د-Entire Column:بۆ زێدەکرنا (داکرنا) ستوینەکێ.



Row: بۆ زێدەکرنا (داکرنا) ڕێزان.

Columns: بۆ زێدەکرنا (داکرنا) ستوویننان

Worksheet: بۆ زێدەکرنا (داکرنا) بەرپەڕەکی (Sheet)ەکی.

Chart: بۆ زێدەکرنا (داکرنا) هێلکارەکی، پشتی داتا دهێتە تۆمارکرن دناڤ خشتەیدا و بۆ تێگەهشتنا بلەز سەبارەت زانیاریێن داتایان ئەوێن پێدڤی ب هێلکاران هەی گۆڕانکاریێن وان بەرچاڤبکەین، وەکو لڤێ نموونەیا لخۆارێ هاتیە روونکرن.

ئەگەر مە بڤێت بلندبوون ونزمبوونا سەقایێ حەفتیەکێ برێیا هێلکارەکی (Chart) ەکی بەرچاڤبکەین کو ب ڤی شێوەی بیت:-

| روژ | بلندترین پله | نزمترین پله |
|---|---|---|
| شەمبی | ٣١ | ١٥ |
| ١ شەمبی | ٣٣ | ١٨ |
| ٢ شەمبی | ٢٨ | ١٧ |
| ٣ شەمبی | ٢٥ | ١٢ |
| ٤ شەمبی | ٣٠ | ٢٩ |
| ٥ شەمبی | ٣٦ | ٣٠ |
| ئەینی | ٣٧ | ٣١ |




لدەسپێکێ دڤێت ئەو پشکێن مە بڤێت هێلکاری بۆ چێکەین بهێنە دەستنیشانکرن و لدووڤدا دناڤ لیستەیا (Insert)دا کلیکێ لسەر (Chart) بکەین، بۆکسەك بەرچاڤدبیت ودناڤ ڤێ بۆکسێدا ل پشکا (Chart Type) دا دێ جۆرێ هێلکاری هەلبژێرین کو هەرئێك ژوان جۆران بۆ مەبەستەکا تایبەت دهێتە بکارئینان ولدووڤدا لپشکا (Chart Sub Type) جۆرەکێ دێ هەلبژێرین وکلیکێ لسەر Next دکەین، دێ دایلۆك بۆکسەکا دی بەرچاڤبیت وبڤی شێوەی:-




دڤێ پشکێدا بکلیککرن لسەر (Row) ستووینا ئێکێ ئەوا هاتیە دەستنیشانکرن دناڤ هێلکاریدا دێ لسەر بارێ پانیاتییێ (ئاسۆیی) بەرچاڤبیت، و بکلیککرن لسەر (Column) دێ لسەر بارێ ستووینی بەرچاڤبیت.

پشتی هەلبژارتنا ئێك ژ ڤان باران ولدووڤ گونجاندنا کاری کلیکێ لسەر (Next) دکەین (لدەمێ جۆرێ هێلکاری هەلبژارتی نە ل ئاستێ پێدڤیبیت دشیاندایە برێبا دۆگما (Back) بزڤرینەڤە بۆ پێنگاڤا ئێکێ وجارەکادی دپشکا (Chart Type)دا جورەکێ دی دەستنیشانبکەین ولدووڤدا ل پشکا Chart Sub Type شێوەیەکی هەلبژێرین، وکلیکێ لسەر Next بدەین) پشتی کلیککرنا Next دپێنگاڤا دووێدا شێوێ بۆکسێ دی بڤی رەنگی بیت:-




کو دشیاندایە ناڤ ونیشانان بۆ هێلکاری زێدەبکەین و هەروەسا بۆ تەوەرێن ستووینی وئاسویی (پانیاتی) ناڤ ونیشانان دیاربکەین.

پشتی تمامبوونا کاری و دپێنگاڤا سیێدا کلیکێ لسەر Next دکەین ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت:-




دڤێرەدا جهێ هێلکاری دەستنیشاندکەین کو دناڤ (Sheet1 یان Sheet2 یان Sheet3..هتد) دانین یان دناڤ بەرپەرەکێ نوی بهێتە دانان، پێنگاڤا دوماهیکێ دێ دوگما (Finish) کلیککەین هێلکار دێ هێتە بدەستڤەئینان وبڤی شێوەی.



## تێبینی:-

**ئێک**:- ئەگەر مەبڤێت هێلکار بتنیێ بۆ دوو ستووینان یان دوو ڕێزان ژ خشتەی دروستبکەین، پێدڤییە بتنیێ وان دوو ستووینان یان دوو ڕێزان دەستنیشانبکەین، وئەگەر هەردوو ل تەنشت ئێك نەبوون پێدڤییە بەراهیکێ ئێك بهێتە دەست نیشانکرن وپاشان تبلا مە لسەر دوگما (Ctrl)ی لسەر کیبۆردی ببەردەوامی لێدایبیت ودگەلدا ستووین یان ڕێزا دوویێ بهێتە دەستنیشانکرن بڤی شێوەی هەردوو دهێنە دەستنیشانکرن ونەخشە لدووڤ پێدڤییا مە دێ هێتە دروستکرن.

**دوو**:- بۆ هەر گۆڕانکاریەکێ دناڤ هێلکاریدا وەك (جۆر، قەبارە، جۆرێ نڤیسینێ، ڕەنگێ چوار چوڤێن هێلکاری و...هتد)، ئەوژی برێیا دوو جار کلیککرنا دوگما چەپێ یا ماوسی لسەر هێلکاری ئەڤ بۆکسا لخوارێ دیارکری بەرچاڤدبیت دشیاندایە دڤێ بۆکسێدا گۆڕانکاریان ئەنجام بدەین.



**Symbol:-** هەر وەکو ئەم دزانین د بابەتێن زانستیدا ئەم پێدڤی چەند هێمایانە وەك (€، £، µ، ...هتد) بۆ ئەڤی چەندێ برێیا فەرمانی (Symbol) دشیاندایە وان هێمایێن پێدڤی بینینە دناڤ خشتەیان ونڤیسیناندا وبڤان رێکان:-

١-Insert

٢-Symbol

٣-هێمایەکێ دەستنیشاندکەین.

٤-کلیکا لایێ چەپێ لسەر (Insert) دکەین.



-:Page Break بۆ دابەشکرنا شیتان بۆ چەند بەرپەڕان دهێتە بکارئینان. و بکلیککرن لسەر Remove Page Break دناڤ هەمان لیستەیا (Insert) دا فەرمانێ Page Break نامینیت.

-:Function ئەڤ پشکە دهێتە بکارئینان بۆ کارێن ژمێریاری و پێکدهێت ژ چەند فەرمانان و دڤێرەدا بتنێ دێ بەحسێ فەرمانێ (IF) کەین، لدووڤدا بەحسی فەرمانێن دی دێ کەین برێیێن ساناهی تر.

## چەوانیا بکارئینانا IF

ئەڤ فەرمانە دهێتە بکارئینان بۆ پلەیێن بەراوەردکرنێ وەکو نموونە: ئەگەر مە خشتەیەك هەبیت کو دناڤدا نمرێن قوتابیان هاتبنە تۆمارکرن ومەبڤێت ئەنجامێ قوتابیان دیاربکەین ب دەرچوو یان دەرنەچوو برێیا ڤی فەرمانی دشێین ڤی کاری ئەنجام بدەین وبڤی شێوەی:-

١-خشتەی بڤی شێوەی دێ ئامادەکەین.

| | A | B | C | D |
|---|---|---|---|---|
| 1 | | | | |
| 2 | ژ | ناڤ | نەمرە | ئەنجام |
| 3 | ١ | گولچن یونس قادر | ٩٦ | |
| 4 | ٢ | هنار فاروق مونیر | ٤٦ | |
| 5 | ٣ | هانا دانا عادل | ٧٢ | |
| 6 | ٤ | شیلان مەریوان صابر | ٣٥ | |
| 7 | ٥ | یاسین کامال شاهر | ٨٤ | |

٢-خانەیا ئێکێ ژ ستوینا ئەنجامان (D3) دێ ئەکتیڤ کەین.

٣-لیستەیا (Insert ) دێ ڤەکەین.

٤-کلیکێ لسەر( Function ) دکەین.

٥-فەرمانێ (IF) دێ هەلبژێرین.

٦-کلیکێ لسەر (OK) دکەین.




٧-دخانەیا (Logical Test)دا دێ مەرجی نڤیسین بڤی شێوەی:-

(C3>=50)، دخانەیا (Value If True)دا دێ نڤیسین (دەرچوو)،

و د خانەیا (Value If False)دا دێ نڤیسین (دەرنەچوو)




٨-کلیکێ لسەر ( OK) دکەین ئەنجامێ کردارێ یێ خانەیا دیار کری (C3) دێ هێتە دیارکرن ، بۆ زانینا ئەنجامێ خانەیێن دی دێ نیشاندەرێ ماوسی دانینە لسەر خالا راکێشانێ دخانەیا ئەنجام دناڤدا هاتیە دیارکرن (D3) و لدووڤدا بکردارا راکێشان وبەردانا ماوسی دێ هەتا خانەیا دوماهیێ یا ئەنجامان راکێشین. ئەڤجا ئەنجامێ هەمی خانەیێن دی دێ بەرچاڤبن.

| ژمارا | ناڤ | نەمرێن دوماهییێ | ئەنجام |
|---|---|---|---|
| ١ | گولچن یونس قادر | ٩٦ | دەرچوو |
| ٢ | هنار فاروق مونیر | ٤٢ | دەرنەچوو |
| ٣ | هانا دانا عادل | ٧٢ | دەرچوو |
| ٤ | شیلان مەریوان صابر | ٣٥ | دەرنەچوو |
| ٥ | یاسین کامال شاهر | ٨٤ | دەرچوو |

**تێبینی:**

بۆ ئەنجامدانا پشکا (IF) لسەر خشتەیێ لسەری دیار کری دشیاندایە برێکا نەخشەیان بکاربینین وبڤی شێوەی:

دناڤ خانەیا ئێکێدا ژ ستووینا ئەنجامان دێ ڤی نەخشەی نقیسین:-

IF(C3>=50;"دەرچوو";"دەرنەچوو")

Comment: بۆ نڤیسینا تێبینیان لسەر خانەیەکێ یان زێدەتر دناڤ خشتەیاندا دهێتە بکارئینان، ئەڤ فەرمانە پێك دهێت ژ:-

أ-Insert Comment: بۆ نڤیسینا تێبینیێ

ب-Edit Comment: بۆ گۆهرانکاریان لسە ر تێبینیا هاتیە نڤیسین

ج-Show Comment: بۆ بەرچاڤکرنا تێبینیێن هاتینە نڤیسین بشێوەیەکێ بەردەوام ولدووڤدا ئەڤ فەرمانە دهێتە گوهۆڕین بۆ (Hide Comment) ئانکو ڤەشارتنا وان تێبینیان، بۆ زانین ئەڤ هەردوو فەرمانە بتنێ برێیا کلیکا راستێ یا ماوسی دهێنە ئەنجامدان

د-Delete Comment: بۆ ژێبرنا تێبینیان.

Picture: ئەڤ پشکە ژ چەند لقان پێك هاتیە د وانەیێن بۆریدا هاتینە دیارکرن.

Diagram: بۆ دروستکرنا هێلکارێن رێکخستنی (ڤاڤارتن) دهێتە بکارئینان.






**Hyperlink:** دهێتە بکارئینان بۆ گرێدانا خانەیەکێ یان کومەکا خانەیان دناڤ شیتەکێدا دگەل شیتەیەکێ دی دناڤ پرۆگرامێ ئێکسلیدا هەروەسا دشیاندایە خانەیان دگەل فایلێن پرۆگرامێن دی وەك (وێرد، ئەکسس، پاوەرپوینت... هتد) گرێدەین.



**تێبینی:**

بەشێ (Extracting File or Web Page) بۆ گرێدانا خانەیەکێ یان چەند خانەیان دناڤ شیتەکا پرۆگرامێ ئێکسلیدا دگەل فایلەکێ دی یێ پرۆگرامێ ئێکسلی یان فایلێن هەر پرۆگرامەکێ دی دهێتە بکارئینان.

## ليستەيا Format

Cell: ئەڤ پشکە د بەرپەرێن بەری نۆکە بشێوەیەکێ گشتی هاتینە بەحس کرن.

Row: بۆ رێکخستنا رێزەیان ژلایێ (بلنداهییێ، رێکخستنا نڤیسینێ، ڤەشارتن، بەرچاڤکرن)ێ دهێتە بکارئینان وبڤی شێوەی:-

Height: بۆ گوهۆرینا بلنداهیا رێزان دهێتە بکارئینان

Auto Fit: بۆ گونجاندنا خانەیان لدوڤ نڤیسینان.

Hide: بۆ ڤەشارتنا رێزێن هاتینە دەستنیشانکرن دهێتە بکارئینان.

Unhide: بۆ بەرچاڤکرنا رێزێن هاتینە ڤەشارتن دهێتە بکارئینان.

Column: بۆ رێکخستنا ستوونا دهێته بکارئینان وژڤان پشکان پێکدهێت:-

Width: بۆ گوهۆرینا پانیاتیا ستوونان دهێته بکارئینان




Auto Fit Selection: بۆ گونجاندنا نقیسنان دناڤ خانەیاندا لدووڤ پانیاتیا خانەیان دهێته بکارئینان.

Hide: بۆ ڤەشارتنا ستوونێن هاتینه دەستنیشانکرن دهێته بکارئینان.

Unhide: بۆ بەرچاڤکرنا ستوونێن هاتینه ڤەشارتن دهێته بکارئینان.

Standard Width: پانیاتیەکا ستاندەرد بۆ هەموو خانەیان پشتی کلیککرنا ڤی بەشی بۆکسەك بەرچاڤدبیت قەبارێ پانیاتیا مەبڤێت دێ نڤیسین وکلیکێ لسەر (OK) دکەین

:Sheet ژڤان پشکێن خۆاری پێك هاتیە:-

:Rename بۆ گوهۆڕینا ناڤێ (Sheet)ی دهێتە بکارئینان.

:Hide بۆ ڤەشارتنا(Sheet)ی دهێتە بکارئینان رامانا وێ شیت بەرچاڤنەبیت

:Unhide بۆ بەرچاڤکرنا شیتێن هاتینە ڤەشارتن دهێتە بکارئینان.

:Background بۆ دانانا وێنەیەکی لپشت بەرپەڕی (Sheet)ی دهێتە بکارئینان لێ ئەڤ وێنەیە لدەمێ چاپکرنێ دەرناکەڤیت.



:Auto Format ئەڤ فەرمانە پێکهاتیە ژ کومەکا خشتەیێن ئامادەکری لدووف رەنگ و چوارچوڤێن خانەیان و جۆرێ نڤیسینێ... هتد. ودشیاندایە دناڤ خشتەیێن خۆ مفای ژێ وەربگرین.



## گۆنجاندنا مەرجدار

## Conditional Formatting

ئەڤ فەرمانە دهێتەبكارئينان بۆ دانانا مەرجێن گۆنجاندنا زانياريان دناڤ خشتەياندا وەكو نموونە ئەگەر نمرێن قوتابيان بەردەستبن ومەبڤێت نمرێن وان وانەيێن قوتابى لێ دەرنەچووى برەنگێ سۆر بهێنە نڤيسين ئەم دێ مفاى ژڤى فەرمانى بينين وبڤى شێوەى:

١-دەستنيشانكرنا وان خانەيێن نمرە دناڤدا

٢-ليستەيا Format دێ ڤەكەين

٣-Conditional Formatting دێ كليككەين




٤-دناڤ بۆكسەيا Conditional Formatting دا دخانەيا (Conditon1) دا مەرجێ مە بڤێت دێ دياركەين و لدووڤدا كليكێ لسەر دوگما Format ددەين.



٥-لدووڤدا ئەڤ بۆكسا لسەری دهێتە ڤەكرن دناڤدا دشیانداپە دناڤوێدا (جۆرێ فۆنتی، قەبارێ نڤیسینێ، رەنگێ داتایان.. هتد) دیاربکەین لدووڤ حەزا خۆ.

**تێبینی:**

١-دشیانداپە (سێ) مەرجان لسەر خشتەیەکیدا دانین برێیا فەرمانێ (Add).

لێ دڤێت ئەو مەرجە ژ ئێك ودوو دجودابن.

٢-دناڤ فەرمانێ Conditional Formatting ئەڤ پلێن بەراوەردکرنێ هەنە.

## پلەیێن بەراوەردکرنێ

| | |
|---|---|
| 1-Between | ١.دکەڤیتە ناڤبەرا |
| 2-Not Between | ٢.نەکەڤیتە ناڤبەرا |
| 3-Equal To | ٣.یەکسانە بۆ |
| 4-Not \Equal To | ٤.یەکسان نەبیت بۆ |
| 5-Greater Than | ٥.مەزنتربیت ژ |
| 6-Not Greater Than | ٦.مەزنتر نەبیت ژ |
| 7-Less Than | ٧.بچووکتربیت ژ |
| 8-Not Less Than | ٨.بچووکتر نەبیت ژ |
| 9-Greater Than or Equal To | ٩.مەزنتر یان یەکسان بۆ |
| 10-Small Than or Equal To | ١٠بچووکتر یان یەکسان بۆ |

٣-(Delete) دهێتە بکارئینان بۆ ژێبرنا مەرجان.



## لیستەیا Tools




Spelling: ئەڤ فەرمانە دهێتە بکارئینانا بۆ ووردبینکرنا شاشیێن رێنڤیسێ. پشتی پەیڤ دهێتە نڤیسین وبۆ ووردبینکرنا رێنڤیسێ دێ پەیڤێ دەستنیشانکەین ولدووڤدا لیستەیا Tools ڤەکەین وکلیککێ لسەر فەرمانێ (Spelling) ددەین بۆکسەك بەرچاڤدبیت دناڤدا کومەکا پەیڤان وەك پێشنیار بەرچاڤدبن پەیڤا دروست دێ هەلبژێرین وکلیکێ لسەر (Change One) دکەین ئەگەر بتنێ بۆ ئێك پەیڤ بیت وکلیکێ لسەر (Change All) دکەین ئەگەر بۆ گوهۆڕینا پەیڤا هاتیە دەستنیشانکرن ل هەرجهەکێ هاتبینە نڤیسین دناڤ ڤی فایلیدا بیت، لدووڤدا بۆ دەرکەفتن ژ ڤی بۆکسێ دێ دوگما Close کلیککەین.



Auto Correct Options: بۆ دانانا نڤیسینێن ئامادەکری لهەر جهەکی مەبەست پێ هەبیت دناڤ بەرپەڕێن فایلیدا دهێتە بکارئینان.

بۆ نموونە ئەگەر مە بڤێت بنڤیسین (زانستا کۆمپیوتەری) یان هەر نڤیسینەکا مەبەست پێ هەبیت، پێدڤییە دناڤ بۆکسا بەرچاڤدبیت ول پشکا (Replace) دا پیتێن کورتکرێ بۆ وێ نڤیسینێ دیار بکەین و لپشکا (With) نڤیسینا دروست بنڤیسین، ئەڤجا کلیکێ لسەر دوگما (Add) ددەین ولدووڤدا کلیکێ لسەر (OK) دکەین.




لهەرجهەکێ مەبەست پێ نڤیسینا د (Auto Correct Options)دا هاتیە ئامادەکرن بهێتە نڤیسین دێ بڤی شیوەی بیت:-

١-نڤیسینا ئەو کورتکرنا دپشکا (Replace) دا هاتیە نڤیسین.

٢-دوگما (Spac Bar) لسەر کیبۆردی بهێتە بکارئینان.

٣-لدووڤدا نڤیسینا دروست دێ هێتە نڤیسین.

# لیستەیا Data




**Sort ڕیزکرن:-**

ئەڤ فەرمانە هەروەکو بەری نۆکە هاتیە شلوڤەکرن دهێتە بکارئینان بۆ ڕیزکرنێ.

**Filter ڤاڤارتن:-** بۆ ڤاڤارتنا زانیاریان دهێتە بکارئینان لدووف ڤی شێوەی:-

Auto Filter: بۆ ڤاڤارتنێ بشێوەیەکێ بلەز دهێتە بکارئینان، برێیا ڤی فەرمانی دشیاندایە ڤاڤارتنا زانیارییێن مەبەست پێ (ناڤ یان ژمارە یان.. هتد) ئەنجام بدەین.

**نموونە:** ئەگەر مە ئەڤ خشتەیە هەبیت:

| ژ | ناڤێ سیانی | جهێ ژدایکبوونێ |
|---|---|---|
| ١ | سوزان برهان عەزیز | سلێمانی |
| ٢ | کامیران عەلی جەمال | دهۆک |
| ٣ | هەکار محەمەد جەمیل | دهۆک |
| ٤ | شانا عومەر مەولود | سلێمانی |
| ٥ | هاوناز هەردی کەریم | هەولێر |
| ٦ | کوردستان قادر حەسەن | دهۆک |

مەبڤێت بتنێ وان ناڤان ژێك جۆدابکەین ئەوێن ژ دایك بوونا وان (دهۆك) بیت، برێیا فەرمانێ (Auto Filter) دشیاندایە ڤی کاری ئەنجام بدەین وبڤی شێوەی.

١-ڤەکرنا لیستەیا (Data).

٢-کلیککرن لسەر (Filter) ولدووڤدا کلیککرنا فەرمانێ (Auto Format).

٣-ئێکسەر ناڤ ونیشانێن هەر ستووینەکا خشتەی دێ بشێوێ لیستەیەکێ هێنە بەرچاڤکرن دڤێرەدا دێ ستووینا (جهێ ژ دایك بوونێ ) ڤەکەین وکلیکێ لسەر (دهۆك) دکەین.

| ژ | ناڤێ سیانی | جهێ ژدایکبوونێ |
|---|---|---|
| ١ | سوزان برهان عەزیز | (All)<br>(Top 10...)<br>(Custom...) |
| ٢ | کامیران عەلی جەمال | دهوک |
| ٣ | هاوناز هەردی کەریم | سلێمانی<br>هەولیر |

| ژ | ناڤێ سیانی | جهێ ژدایكبوونێ |
|---|---|---|
| ١ | هەكار محمد جميل | دهۆك |
| ٢ | كاميران عەلی جەمال | دهۆك |
| ٣ | كوردستان قادر حسن | دهۆك |

**تێبینی:** بۆ راكرنا نيشانيێن ليستەيان كو برێيا (Auto Filter) هاتينە دانان دێ ڤان رێكان بكارئينين:

١-ڤەكرنا ليستەيا Data

٢-كليككرن لسەر Filter

٣-كليككرن لسەر Auto Filter

## :Validation

دەمێ مە بڤێت مەرجەكێ تایبەت بدەینە خشتەیەكی یان ستووینەكێ یان ڕێزەكێ بۆ وەرگرتنا زانیاریان، بۆ نموونە ئەگەر مە خشتەیەك هەبیت بۆ نڤیسینا مووچەیان كو هەمی مووچە ژ (١٥٧٠٠٠) دیناران زێدەتر بن یان كێمتر وەرنەگرن، یان ئەگەر مە بڤێت خشتێ مە بتنێ وان فەرمانبەران وەربگریت ئەوێن خزمەتا وان ژ (٣٠) سالان زێدەتر بیت ودهەمان دەمدا لدەمێ هەر خانەیەكا مووچەی یان سالێن خزمەتێ بهێتە دەست نیشانكرن پرۆگرام نامەیەكێ بەرچاڤبكەت بۆ دیار كرنا وان زانیارییێن دگونجن دگەل ڤان خانەیان ودهەمان دەمدا ئەگەر مە بشێوەیەكێ شاشی نڤیسی مە ئاگەهدار بكەت.



## نموونە ١:-

ئەم یێ خشتەیەکێ بۆ فەرمانبەرێن وەزارەتەکا تایبەت پردکەین، لێ ئێك ژ مەرجان ئەوە کو دڤێت ژییێ فەرمانبەران ل وێ وەزارەتێ دناڤبەرا (٢٣-٤٠) سالاًن بن. بۆ ڤێ چەندێ پشتی ئامادەکرنا خشتەی دێ ستووینا (ژییێ فەرمانبەری) لێ دهێتە نڤیسین دەستنیشانکەین لدووڤدا دناڤ لیستەیا (Data)دا لسەر فەرمانێ (Validation) دێ کلیککەین بۆکسەك دێ بەرچاڤبیت کو ژڤان پشکان پێکهاتیە

Setting ,Input Message ,Error Alert

دپشکا (Setting) دا دێ مەرجێ خۆ دخانەیا (Allow) دا دێ (Whole Number) هەلبژێرین ودخانەیا (Data) دا دێ (Between) هەلبژێرین لدووڤدا دخانەیا (Minimum)دا دێ بچوویکترین ژمارە نڤیسین کو(٢٣) سالە ودخانەیا (Maximum) دا دێ مەزنترین ژمارە نڤیسین کو (٤٠) سالە.



لدووڤدا دپشکا (Input Message)دا ئەو ئاگەهدار یا دهێتە بەرچاڤکرن لدەمێ ماوسی ددانینە لسەر خانەیەکێ ژ خانەیێن (ژییێ فەرمانبەری) هێتە نڤیسین، بۆ ڤێ مەبەستێ دناڤ خانەیا (Title)دا دێ ئاگەهداری هێتە نڤیسین وەك (ژییێ فەرمانبەری) و دخانەیا (Error Message) دا دێ بۆ نموونە نڤیسین (دناڤبەرا ٢٣ تا ٤٠ سالأن بیت).




لدووڤدا دپشکا (Errot Alert) دا بۆ وێ چەندێ ئەگەر مە سالێن خزمەتێ بشاشی نڤیسین برێیا نامەیەکا تایبەت ئاگەهداریا مە بکەت دڤێرەدا دخانەیا (Style) جۆرێ ئاگەهدارییێ دێ هەلبژێرین و دخانەیا (Title) دا دێ ناڤ ونیشانێن ئاگەهدارییێ نڤیسین،

و دناڤ خانەیا (Error Message)دا دێ نامەیا ئاگەهدارییێ نڤیسین بۆ نموونە (ئەڤ ژمارەیا تە تێئێخستی نە یا دروستە) یان هەر رستەیەکا دێ بیت بۆ وێ چەندێ کو بزانین مە شاشیەك هەیە.




**<u>نموونە ٢:-</u>** ل قوتابخانەیێن بنەرەتی بۆ وەرگرتنا قوتابیان ل پولا ئێکێ لسالا خواندنێ ٢٠١١-٢٠١٢ بریارە کو قوتابیێن ژییێ وان ژ (٦) سالان کێمتر نەهێنە وەرگرن، دوی دەمیدا بۆ دانانا مەرجەکی دناڤ بۆکسەیا فەرمانێ (Validation) دا ولپشکا (Setting) مەرجێ خۆ دێ نڤیسین و ل خانەیا (Allow) دێ (Whole Number) هەلبژێرین و دخانەیا (Data)دا دێ (Greater than or Equal to) دێ هەلبژێرین.

لدووڤدا ل خانەیا (Minimum) دا دێ بچوویکترین ژمارە نڤیسین ئەوژی (٦)ە دنموونەیا مەدا.

دپشکا (Input Message) دا دێ ئەو ئاگەهداری هێتە نڤیسین ئەوا مە

بڤێت بەرچاڤبیت دەمێ خانەیەکا (ژییێ قوتابی) دەستنیشاندکەین وبۆ ڤێ چەندێ دخانەیا (Title)دا دێ ناڤ ونیشانێن ئاگەهداریێ نڤیسین ودخانەیا (Input Message) دا دێ نامەیا ئاگەهداریێ نڤیسین وەك (پێدڤییە تەمەنێ قوتابی ژ ٦ سالان کێمتر وەرنەگری).

لدووڤدا دێ چینە دناڤ پشکا (Error Alert) دا بۆ وێ چەندێ لدەمێ ئەم بشاشی ڤە تەمەنەکی کێمتر ژ (٦) سالان بنڤیسین برێیا نامەیەکێ ئاگەهداریا مە بکەت لسەر ڤێ شاشیێ لەوا دناڤ خانەیا (Style)دا دێ جۆرێ ئاگەهداریێ هەلبژێرین ودناڤ (Title)دا دێ ناڤ ونیشانەکێ بۆ ئاگەهداریێ نڤیسین و دخانەیا (Input Message) دێ نامەیا ئاگەهداریا شاشیێ نڤیسین وەك(ئەڤ تەمەنە نا هێتە وەرگرتن) بۆ وێ چەندێ بزانین شاشیا مە چییە.




لدووڤدا ئەگەر بشاشی ڤە ژیێ قوتابی ژ (٦) سالان کێمتر هاتە نڤیسین ئەڤ نامەیا دێ بەرچاڤبیت.



## Group and Outline:

ئەڤ فەرمانە دهێتە بكارئینان بۆ وێ چەندێ ئەگەر زانیارییێن دناڤ خشتەیاندا دزۆربن دوی دەمیدا دشیاندایە چ دبوارێ ستووینیدا یان دبوارێ رێزاندا ئەم زانیاریان بشێوێ گرۆپان ئامادەبكەین، بۆ ڤێ مەبەستێ وان رێزێن یان ستووینێن مەبەست پێ بۆ دانانا گرۆپی دەستنیشانكەین.

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊ ❊

❊ ❊ ❊ ❊

❊

## لیستەیا Window

New Window: بۆ ڤەکرنا پەنجەرەکا نوی بۆ فایلی دهێتە بکارئینان

Arrange: بۆ دەرکرنا چەند فایلان پێکڤە (بشێوێ رەخ ئێك ڤە یان بشێوێ پانیاتی یان بشێوێ ستووینی یان لدووف ئێك) دهێتە بکارئینان.

Hide: بۆ ڤەشارتنا فایلی دهێتە بکارئینان

Unhide: بۆ بەرچاڤکرنا فایلێن هاتینە ڤەشارتن دهێتە بکارئینان.

Split: بۆ دابەشکرنا فایلی بۆ چوار پشکان دهێتە بکارئینان ودشیاندایە دهەر پشکەکێدا کاربکەین.

Freeze Panes: بۆ چەسپاندنا ریز یان ستووینێن ناڤ ونیشانان دهێتە بکارئینان، وەکو نموونە ئەگەر مە خشتەیەك هەبیت و ژمارا زانیاریێن وێ دزۆربن وەکو نموونە ژ (١٠٠)ان زێدەتربن دوی دەمیدا ریزێن ناڤ ونیشانان دهێنە بەرزەکرن لدەمێ ئەم دچینە دناڤ زانیاریێن دوویر ژ ناڤ ونیشانان، لەوا برێیا ڤی فەرمانی ئەم ناڤ ونیشانێن ریزان یان یێن ستووینان لدووف پێدڤییا مە دناڤ ڤی خشتەیدا د چەسپینین کو بشێوەیەکێ بەردەوام بەرچاڤبن.

# چەوانیا ئەنجامدانا کردارێن

## (کومکرن، ژێبرن، لێگدان، دابەشکرن)ێ

### ئێک: کومکرن:

لدەسپێکا ژمێریارییێدا پێدڤییە ناڤێ وان خانەیان بزانین ئەوێن مە بڤێت کرداران لسەر ئەنجام بدەین.

**نموونە:**

دڤی خشتێ ل خوارێدا ژمارە (٩٤) دخانەیا (C3)دا هاتیە نڤیسین ئانکو ل ستوونا (C) ول رێزا (٣).

| | E | D | C | B | A |
|---|---|---|---|---|---|
| 1 | | | | | |
| 2 | ئەنجام | ژ. ئێکێ | ژ. ئێکێ | ناڤ | |
| 3 | | ٩٢ | ٩٤ | ئەڤین صابر | ١ |
| 4 | | ٨٢ | ٨٤ | ناسا حسین | ٢ |
| 5 | | ٨١ | ٧٤ | ڤینا محەمەد | ٣ |
| 6 | | ٩٣ | ٩٨ | دلوار زانا | ٤ |

ئەگەر مە بڤێت ژمارە ((٩٤ ، ٩٢) کومبکەین دناڤ خانەیا (E3) دا دێ بڤی شێوەی ئەنجامددەین.

١-خانەیا (E3) دەست نیشاندکەین

٢-نیشانا (=) نڤیسین

٣-کلیککرن لسەر خانەیا (C3) ولدووڤدا نڤیسینا نیشانا(+) ولدووڤدا کلیککرن لسەر خانەیا (D3) لدووڤ دوگما (Enter) لێدەین.

یان بشێوەیەکێ دی پشتی دەست نیشانکرنا خانەیا (E3) ئێکسەر دناڤدا ڤی نەخشەی بنڤیسە (=C3+D3) ودۆگما (Enter) بکاربینە.

یان لجهێ دوگما (Enter) دشیاندایە نیشانا (√) لسەر شەریتا هاوکێشەیان بکاربینین بۆ بدەستڤەئینانا ئەنجامان، ئەگەر ئەم پێدڤی بووین هەمان کرداری لسەر ژمارەیێن دی یێن خشتەی بکاربینین پێدڤی ناکەت جارەکا دی کرداری دووبارە بکەین لێ پێدڤییە ڤان پێنگاڤان باڤێژین:-

١-دەستنیشانکرنا وێ خانەیا ئەنجامێ کردارا ئێکێ یا کومکرنێ دناڤدا هاتیە دیار کرن.

٢-دانانا نیشاندەرێ ماوسی لسەر خالا راکێشانێ دخانەیا دەستنیشانکریدا.

٣-لدەمێ نیشاندەرێ ماوسی دبیتە (+) ئێکسەر رێکا راکێشان وبەردان برێیا ماوسێ چەپێ بۆ لایێ ژمارەیێن پێدڤی بۆ کومکرنێ رابکێشە.

بڤان پێنگاڤان دێ نەخشەیێ هاتیە دانان بۆ کومکرنا خانەیێن (C3) و (D3) هێتە چەسپاندن لسەر خانەیێن دوڤدا.

**تێبینی:** ئەڤ پێنگاڤە بۆ چەسپاندنا هەمی کرداران دهێنە بکارئینان

## دوو: ژێبرن:

هەمان کردارا لسەری دێ دووبارە کەین لێ لجهێ هێمایێ کومکرنێ (+) دێ هێمایێ ژێبرنێ (-) بکارئینین، ئانکو نەخشە دێ بڤێ رەنگی بیت:-

=C3-D3

## سێ: لێکدان:

هەمان کردارا لسەری دێ دووبارە کەین لێ لجهێ هێمایێ کومکرنێ (+) دێ هێمایێ لێکدانێ (*) بکارئینین، ئانکو نەخشە دێ بڤێ رەنگی بیت:-

=C3*D3

**چۆار: دابەشکرن:**

هەمان کردارا لسەری دێ دووبارە کەین لێ لجهێ هێمایێ کومکرنێ (+) دێ هێمایێ دابەشکرنێ (/) بکارئینین، ئانکو نەخشە دێ بڤێ رەنگی بیت:-

=C3/D3

## بكارئينانا ئايكۆنێ نەخشەيان

## Fx

هەروەكو دزانين كو لهەر بوارەكێ زانستيدا كومەكا نەخشەيان هەيە، دناڤ پرۆگرامێ ئێكسليدا هندەك ژڤان نەخشەيان هاتينە دانان كو برێيا وان بساناهی دگەهينە ئەنجامان، بكارئينانا ڤان نەخشەيان بڤان هەردوو رێكان ئەنجام ددەين:-

**ئێک/** بكارئينانا ماوسی لسەر ئايكۆنێ fx، لدووڤدا ئەڤ بۆكسە بەرچاڤدبيت:-




١- دڤێرەدا دشياندايە ئێكسەر ناڤێ نەخشەی بنڤيسين ولدووڤدا دۆگما (GO) كليكبكەين

٢- دڤێرەدا دشياندايە ئێكسەر نەخشەی هەلبژێرين

٣- دڤێرەدا دشياندايە كومەلا نەخشە دناڤدا هەلبژێرين

**دوو/** ئێکسەر دشیاندایە دناڤ خانەیێدا نەخشەی بنڤیسین بۆ نموونە ئەگەر مە بڤێت تێکراییا کومەکا نمرەیان ژ خانەیا (A1) تا خانەیا (A6) بینیەدەر دێ ڤی نەخشەی دناڤ خانەیکا جودا نڤیسین:-

=Average(A1:A6)

## نیاسینا هندەک ژ نەخشەیان

### SUM کومکرن:

دهێتەبکارئینان بۆ کومکرنا کومەکا ژمارەیان، یاسایا ڤی نەخشەی بڤی رەنگی یە:-

=SUM(A1:A10)

دڤێرەدا کۆمپیوتەر بکارێ کومکرنا ژمارەیان ژ خانەیا (A1) تا خانەیا (A10) رادبیت، دشیاندایە ڤێ کریارێ ب رێیا ئایکۆنێ ( ∑ ) ئەنجام بدەین،

پشتی دیار کرنا خانەیێن پێدڤی بۆ کومکرنێ وبۆ بەرچاڤکرنا ئەنجامان دشیاندایە هەمان ئایکۆن جارەکا دی کلیکبکەین یان ژی لسەر کیبۆردی دۆکما Enter بکاربینین.

### Average تێکرایی:

بۆ ئەنجامدانا تێکراییا کومەکا ژمارەیان دهێتە بکارئینان.

**نموونه:**

ئەگەر تە بڤێت تێکراییا سالانە یا وانەیا بیرکاریێ بزانی، پێدڤییە تێکراییا نمرێن وەرزێ ئێکێ و نیڤا سالێ وتێکراییا نمرێن وەرزێ دووێ کومبکەی ودابەشی (٣) بکەی.

لێ ئەڤ کارە دکۆمپیوتەریدا دشیاندایە ئێکسەر ڤی نەخشەی بنڤیسین:-

=Average(57;76;85)

ئەنجام دهێتە بدەستڤەئینان لێ ئەگەر کومەکا ژمارەیان مە هەبیت دێ دناڤ کڤانێن نەخشەیدا ناڤێ خانەیان نڤیسین دا بشێن ئێکسەر وەك بژاندنەکێ بۆ ڤی نەخشەی لسەر خانەیێن دی ئەنجام بدەین لەورا بۆ نموونە:-

=Average(A1:A6) تێکراییا ژمـــارەیان ژ خانەیا (A1) تا خانەیا (A6)

=Average(A1,A3,A6) تێکراییا ژمارەیان دناڤ خانەیێن (A1 و A3 و A6)دا

| 57 | 76 | 85 | 73 |
|---|---|---|---|

**Max مەزنترین ژمارە:**

بۆ دیارکرنا مەزنترین ژمارە دناڤ کومەکا ژمارەیاندا دهێتە بکارئینان، یاسایا ڤی نەخشەی پێکدهێت ژ:-

=Max(a:b)

a: خانەیا ئێکێ ژ کوما ژمارەیان.

b:خانەیا دوماهیکێ ژ کوما ژمارەیان.

| A5 | A |
|---|---|
| 1 | 12 |
| 2 | 15 |
| 3 | 56 |
| 4 | 67 |
| 5 | 67 |

### Min بچووکترین ژمارە:

بۆ دیارکرنا بچووکترین ژمارە دناڤ کومەکا ژمارەیاندا دهێتە بکارئینان، یاسایا ڤی نەخشەی پێکدهێت ژ:-

=Min(a:b)

a: خانەیا ئێکێ ژ کوما ژمارەیان

b: خانەیا دوماهیکێ ژ کوما ژمارەیان

### Sin تەژی:

ئەڤە ئێك ژ نەخشەیێن سێگوشەییێ نە ویاسایا وێ بڤی رەنگی یە:-

= Sin (گوشەیا دیارکری)

**نموونە:**

ئەگەر مەبڤێت تەژیا (Sin)ا گوشەیا (٣٠)ێ بزانین بڤی رەنگی دێ هێتە نڤیسین:

=Sin(30*pi()/180)

ئەگەر هزرێ تێدا بکەین دێ بینین گوشە هاتیە گوهۆڕین بو گوشەیا کەرتی (π/180) ئەڤەژی ژبەر هندێ یە کو سیستەمی پیڤانا گوشەیان دناڤ کۆمپیوتەریدا سیستەمەکێ نیڤ تیرەییە، لەورا پێدڤییە بهێتە بگوهۆڕین بۆ سیستەمێ شێستی، هەروەسا سەبارەت هەمی نەخشەیێن دی یێن سێگوشەییی وەك (cot, sec, cos, tan...هتد) هەمان یاسا یا هەی.

### Log لۆگاریتم:

بۆ دەرئێخستنا لۆگاریتما ژمارەیان دهێتە بکارئینان. یاسایا ڤی نەخشەی بڤی رەنگی یە:-

=log(number,base)

**نموونە:**

ئەگەر مەبڤێت لۆگاریتما (١٠٠) بۆ بنیاتا (٢) بینینەدەر دێ بڤی رەنگی هێتە نڤیسین

=log(100,2)

ژبیرا تە نەچیت ئەو ژمارەیا پێدڤی بۆ دەرئێخستنا لۆگاریتما وێ پێدڤییە پوزەتیڤ بیت چونکە دبوارێ نەخشەیا لۆگاریتمێدا پێکهاتێن وێ ژمارەیێن راستەقینە یێن پوزەتیڤ بن.

## LOG10 لۆگاریتما سرۆشتی:

بۆ وەرگرتنا لۆگاریتما سرۆشتی ئانکو بنیاتێ لۆگاریتمی (١٠)ە دهێتە بکارئینان وپێدڤی بنڤیسینێ ناکەت. بڤی رەنگی فەرمان دهێتە نڤیسین

=log10(number)

## Combin گونجین:

بۆ دیارکرنا رێکێن هەلبژارتنا یان راکێشانا دانەیێن (ر) ژ کومەکا دانەیان (ن) دهێتە بکارئینان، بۆ نموونە ئەگەر مەبڤێت بزانین بچەند رێکان ئەم دشێن بەرسڤا (٥) پرسیاران ژ (٧) پرسیاران بدەین ئەڤ نەخشەیە دێ بڤی رەنگی هێتە نڤیسین:-

=combin(7,5)

## Count هژمارتن:

بۆ زانینا ژما رەیا وان خانەیێن داتا دناڤدا هاتینە تۆمارکرن دهێتە بکارئینان، بۆ نموونە ئەگەر مە بڤێت بزانین ژ خانەیا (A1) تا خانەیا (A25) چەند خانەیان داتا دناڤدا هاتینە تۆمارکرن دێ بڤی رەنگی نڤیسین

=count(A1:A25)

## Degrees پلە:

بۆ گوهۆڕینا پێوانا گۆشەیان ژ سیستەمێ نیڤ تیرەیی بۆ سیستەمێ شێستی دهێتە بکارئینان، بۆ نموونە ئەگەر مە بڤێت گۆشەیا (pi) بگوهۆڕین بۆ سیستەمێ شێستی دێ بڤی رەنگی نڤیسین:-

=degrees(pi())




**Radians نیف تیرەیی:**

دهێته بکارئینان بۆ گوهۆڕینا پێوانا گۆشەیان ژ سیستەمێ شێستی بۆ سیستەمی نیف تیرەیی، بۆ نموونه ئەگەر مه بڤێت گۆشەیا (٦٠)پله بگوهۆڕین بۆ سیستەمێ نیف تیرەیی دێ بڤی ڕەنگی نڤیسین:-

=Radians(60)

بهەمان شێوێ نموونەیا لسەری دیار کری دشیاندایه ئەنجام بدەین

**ABS بهایێ رووت:**

بۆ بدەستڤەئینانا بهایێ رووت یێ ژمارەیێن راستەقینه دهێته بکارئینان، بۆ نموونه ئەگەر مەبڤێت بهایێ رووتێ ژماره (-٥) بینینەدەر دێ بڤی رەنگی نڤیسین:-

=ABS(-5)

## FACT لێگدەرێن ژمارەیان:

دهێته بکارئینان بۆ دیتنا لێگدەرێن ژمارەیێن پوزەتیف یێن تەمام، ئەگەر مەبڤێت لێگدەرێن ژمارە (٣) بینینەدەر، ئەڤی نەخشەی دێ نڤیسین:-

=FACT(3)

دیارە بەری نۆکە دبابەتێ بیرکارییێدا ئەڤ لێگدەرە هاتیە وەرگرتن کو بڤی شێوەی بۆ:-

٣!=٣*٢*١=٦

## Product دەرئەنجام:

بۆ دیتنا ئەنجامێ لێگدانا چەند ژمارەیان دهێتە بکارئینان، بۆ نموونە ئەگەر مەبڤێت ئەنجامێ لێگدانا ڤان ژمارەیان (١٢،٣٤،٤٥) بینینەدەر نەخشە دێ بڤی شێوەی هێتە نڤیسین:-

=Product(12,34,45)

دڤان نەخشەیێن هاتینە دیارکرن دیار دبیت کو دشیاندایە برێیا ئایکۆنێ fx هەر نەخشەیەکێ مەبڤێت ئەنجام بدەین وهەروەسا دشیاندایە ئێکسەر نەخشەی دناڤ خانەیاندا بنڤیسین.

**نموونە:** ئەگەر مەبڤێت بهایێ رووتی ژمارە (-٨) بزانین دێ ڤان کاران ئەنجامدەین.

١-کلیکێ لسەر خانەیا مەبەست پێ بۆ دەرئێخستنا ئەنجامان ولدووڤدا کلیکێ لسەر ئایکۆنێ fx ددەین ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت.




٢-پشتی کلیککرنا (OK) بۆکسەکا تایبەت ب نەخشەیا هاتیە هەلبژارتن دێ هێتە بەرچاڤکرن.



گرێدانا داتایان دناڤ خانەیێن شیتەکی دگەل شینەکێ.

ئەگەر مە بڤێت د شیتەیەکی دا (بەرپەرەکیدا) داتایێن خانەیەکا شیتەکێ دی بکاربینین دێ بڤی شێوەی بیت:-

ئەگەر مە دوو شیت هەبن بناڤێن (١ و ٢) ومەبڤێت د شیتێ ژمارە (٢)دا داتایێن خانەیا (A1) دشیتێ ژمارە(١)دا کومبکەین دگەل داتایێن خانەیا (B2) دشیتێ ژمارە(٢)دا، پێدڤیە دناڤ شیتێ ژمارە (٢)دا دناڤ خانەیەکا دەستنیشانکری ڤی نەخشەی بنڤیسین :-




یان ژی دناڤ خانەیا ئەنجامان نڤیسین (=) و پاشان شیتێ (١) ڤەکەین و خانەیا (A1) دەستنیشانکەین و پاشان نیشانا (+) بنڤیسین و لدووڤدا خانەیا (B2) ژ شیتێ (2) دەستنیشانکەین و لدووڤدا (Enter) بکاربینین.

## Subtotal كومكرنا پشكان:

ئەگەر داتايێن ژمێرياری مە هەبن كو ژ كومەلەكا ژمێرياريێن جودا جودا پێكهاتبن دشياندايە برێيا فەرمانێ (Subtotal) سەرجەمێ هەر جۆرەكی ديار بكەين ولدووڤدا سەرجەمێ گشتی ژی ديار بكەين

بابەت

برێ پارەی
(دۆلار)

| | A | B | C |
|---|---|---|---|
| 1 | subject | usd | |
| 2 | house | 358 | |
| 3 | street | 741 | |
| 4 | stationary | 789 | |
| 5 | street | 456 | |
| 6 | stationary | 852 | |
| 7 | street | 963 | |
| 8 | house | 10 | |
| 9 | stationary | 120 | |
| 10 | street | 236 | |
| 11 | | | |
| 12 | | | |

سەحكەيێ سێ جۆرە پرۆژان هەنە
خانی، جادە، پێدڤییێت قوتابخانا

بۆ ئەنجامدانا کردارا کومکرنا پشکان ڤان پێنگاڤان دێ بکارئینین:-

١- پێدڤییە داتایان لدووف ناڤێ جوری رێزبکەین ژ مەزنی بۆ بچووکی یان بەروڤاژی.

٢- دلیستەیا (Data)دا دێ فەرمانێ (Subtotal) هەلبژێرین.



٣- ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت.




د ڤێرەدا ئەو ستوونا ناڤێن جۆران دناڤدا دێ دەست نیشانکەین

د ڤێرەدا کردارا بیرکاریێ یا پێدڤی دهێتە هەلبژارتن. دیارە کردارا کومکرنێ هەلبژارتییە

ستوونا مەبەست بۆ کومکرنێ

لدووڤدا کلیکێ لسەر (Ok) دکەین

٤- دێ بینین کردارێن کومکرنا پشکان بڤی شێوەی خوارێ هاتیە ئەنجامدان، کو سەرجەمێ پارێ هاتیە خەرجکرن بۆ هەر پرۆژەیەکی دیار دکەت زێدەباری سەرجەمێ گشتی

برێیا ڤان هەر سێ ئایکۆنان دشیاندایە ژمێریاریان بشێوەیێن جودا جودا بەرچاڤبکەین وەک (بتنێ سەرجەمێ گشتی، یان سەرجەمێن پرۆژەیان دگەل سەجەمێ گشتی یان هەمی پێکڤە)

سەرجەمێ پارێ بۆ جادەیان هاتیە مەزاختن

سەرجەمێ پارێ بۆ خانیان هاتیە مەزاختن

سەرجەمێ گشتی یێ هەر سێ پرۆژەیان

سەرجەمێ پارێ بۆ پێدڤیێن نڤیسینگەها هاتیە مەزاختن

٥- بۆ راكرنا كردارا كومكرنا پشكان پێدڤییە جارەكادی بزڤرینە لیستەیا Data وكلیكێ لسەر فەرمانێ (Subtotal)بدەین، لدووڤدا دناڤ بۆكسەیا بەرچاڤدبیت دێ كلیكێ لسەر دۆگمەیا (Remove All) دەین.



## ئارمانجا مەبەست

## Goal Seek

ئەڤ  زاراڤە دهێتە بکارئینان بۆ گەهاندنا فورمولەکێ ببهایەکێ داخوازکری، بۆ نموونە ئەگەر قوتابیەکی  دوانەیا بیرکارییێدا تێکراییا ئێکێدا ٤٣ وەرگرتیە و ل نیڤا سالێدا ٥٦ وەرگرتیە ومەبڤێت بزانین تێکراییا دووێ دێ چەند بیت؟ کو د تێکراییا سالأنە دا دەربچیت، هزرێ دڤێ کردارا لخوارێدا بکە:-

أ-پشتی دروستکرنا ڤی خشتەی

| | A | B | C | D |
|---|---|---|---|---|
| 1 | | | | |
| 2 | 43 | 56 | | |
| 3 | | | | |

ب-دخانەیا (D2)دا نەخشەیا (Average) دێ نڤیسین وبڤی شێوەی

=Average(a2:c2)

وئەنجامێ وێ دێ دەرئێخین

| | A | B | C | D |
|---|---|---|---|---|
| 1 | | | | |
| 2 | 43 | 56 | | 49.5 |
| 3 | | | | |

ج- دناڤ لیستەیا (Tools)دا فەرمانێ (Goal Seek) کلیکبکە وبڤی شێوەی :-




د- ئەڤ بۆکسە بەرچاڤدبیت



١- ئەو خانەیا ئەنجام دناڤدا دێ نڤیسین.

٢- ئەنجامێ مە بڤێت بگەهینێ.

٣- ئەو خانەیا مە بڤێت گورانکاریا دناڤدا ئەنجام بدەین بۆ گەهشتن بۆ ئەنجاما مەبەست پێ.

هـ- ئەو ئەنجاما بدەستڤەدئینین کو مەبەستا مە پێی یە دێ بڤی شێوەی بیت.




ئەو نمرەیا پێدڤی بدەستڤە بینین

**پرسیار:** نەرخێ (س) دڤی نەخشەیدا دیاربکە:-

٣+س=٧

# راهێنان

**پ١/** ڤی خشتەی بشێوی لخۆارێ دیار کری دروستبکە:-

| D | C | B | A | |
|---|---|---|---|---|
| قوناغا خواندنێ | ژ دایک بوون | ناڤێ سێ قولی | ژ | 1 |
| | | | | 2 |
| | | | | 3 |
| | | | | 4 |
| | | | | 5 |
| | | | | 6 |
| | | | | 7 |
| | | | | 8 |

**پ٢/** ڤان کردارێن جەبری ئەنجامبدە:-

١- ١٢+٣٤=

٢- ٢٥/٦=

٣- ٣٥*١٩=

**پ٣/** لیستەیەکا مووچەیان بڤی شێوێ لخوارێ دیار کری دروستبکە:-

| G | F | E | D | C | B | A | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| سەرجەم | دەرمالێن هاتن و چوونێ | خانەنشین | دەرمالێن پیشەیی ٢٠٪ | مووچە | ناڤێ سێ قولی | ژ | 1 |
| | | | | | | | 2 |
| | | | | | | | 3 |
| | | | | | | | 4 |
| | | | | | | | 5 |
| | | | | | | | 6 |

**پ٤/** کردارێن ڤی خشتەی ئەنجامبدە:-

| G | F | E | D | C | B | A | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| | | 64 | 97 | 95 | 65 | 15 | 1 |
| | | 98 | 64 | 64 | 47 | 46 | 2 |
| | | 897 | 51 | 34 | 58 | 68 | 3 |
| | | 654 | 81 | 28 | 49 | 57 | 4 |
| | | 358 | 68 | 39 | 48 | 15 | 5 |
| | | | | | | | 6 |

**پ٥/** دڤێت بهایێ (س) چەندبیت دڤی هاوکێشێدا (س+٦=٨) برێیا فەرمانێ Goal Seek بەرسڤێ بدە.

**پ٦/** ب چەند رێکان دشیاندایە بەرسڤا (٣) پرسیاران ژ (٦) پرسیاران ئەنجام بدەین، مفایێ ژ ئێك ژنەخشەیان وەربگرە بۆ بدەستڤەئینانا بەرسڤێ.

**پ٧/** کردارا Subtotal بۆ ڤی خشتەی ئەنجامبدە.

| | A | H |
|---|---|---|
| 1 | بابەت | بها |
| 2 | پێنووس | 45 |
| 3 | پەر | 32 |
| 4 | راستە | 95 |
| 5 | پەر | 78 |
| 6 | راستە | 12 |
| 7 | پێنووس | 45 |
| 8 | پەر | 65 |
| 9 | راستە | 32 |
| 10 | پێنووس | 33 |
| 11 | پەر | 335 |
| 12 | | |

**پ٨/** ب رێکا پرۆگرامێ ئێکسلی بهایێ ڤان نەخشەیێن بازنەیی بینەدەر:-

Sec30 - tan45 - cos60 - sin30

**پ٩/** پلەیێن بەراوەردکرنێ بکاربینە بۆ لیستەکا مووچەی کو تێدا دەرماڵەیا پیشەیی لدووف مووچێ سەرەکی بگهوریت و بڤی شێوەی:-

- ئەگەر مووچەیێ وی ١٥٠٠٠٠ بوو ٢٠٪ بدەتێ
- ئەگەر مووچەیێ وی ١٦٠٠٠٠ بوو ٣٠٪ بدەتێ
- ئەگەر مووچەیێ وی ١٨٠٠٠٠ بوو ٤٠٪ بدەتێ

**پ١٠/** هێلکارەکی (Chart) بکێشە بۆ نمرەیێن خۆ د وەرزێ ئێکێ و وەرزێ دوویێدا.